# میمۆ، میمۆکەی من





ئەسترید لیندگرێن

ئەنوەر قادر محەمەد
لەسویدییەوە کردوویەتی بەکوردی

- ناوی کتێب : مێو .. مێوەکەی من
- بابـــــەت : چیرۆکی منداڵان
- وەرگێڕانـــی : ئەنوەر قادر محەمەد
- سەرپەرشتیاری چاپ : عەتا مەحمود
- تیراژ : ( ١٠٠٠ ) دانە
- ژمارەی سپاردنی ( ٤٠٤ )ی ساڵی ٢٠٠٣ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

سایتی وەزارەتی رۆشنبیری
www.roshnbiri . org .

ئەسترید لیندگرێن

# میۆ، میۆکەی من

نیگار: ئیلۆن ڤیکلاند

ئەنوەر قادر محەمەد

لەسویدییەوە کردوویەتی بە کوردی

خەبات عارف

بەراوردی وەرگێڕانەکەی کردووە و
پێیداچووەتەوە



# شەو و ڕۆژ بەڕێوەیە



کەسێ هەبێ ڕۆژی پانزەی ئۆکتۆبەری ساڵی پار گوێی لە ڕادیۆ بووبێ؟ کەسێ گوێی لێ بوو، هەواڵی کوڕێکی ونبوویان دەپرسی؟ ئەئاوایان دەگوت: پۆلیسی ستۆکهۆڵم بەدوای کوڕێکی نۆ ساڵانە، بەدوای (بو ڤیلهێلم ئولسۆن)دا دەگەڕێ، کە ئێوارەی ڕۆژی ڕابردوو لە سەعات شەشی ئێوارەوە لە ماڵەکەی خۆی لە ئوپلاندسگاتان، ژمارە ١٣، چۆتە دەرەوە و ئیتر نەگەڕاوەتەوە.

بو ڤیلهێلم ئولسۆن قژی کاڵە و چاوی شینە، لە کاتی ونبوونیدا پانتۆڵێکی کورتی قاوەیی لەپێدا و بلووسێکی خۆڵەمێشیی چنراوی

لەبەردا و کلێتەیەکی سووری بچکۆلەشی لەسەردا بووە. هەر کەس هەواڵێکی دەربارەی ونبوو لە لایە، دەتوانێ بیگەێنێتە بەشی هەواڵ و سۆراخی پۆلیس.

بەڵێ، ئاوایان وت، بەڵام هیچ هەواڵ و سۆراخێکی بو ڤیلهێلم ئولسۆن نەبوو. چووبووە دەرەوە. کەسیش قەت نەیزانی بەرەو کوێ ڕێگای گرتۆتە بەر. کەس نەیزانی، جگە لە من، چونکە من بۆ خۆم هەوم، بو ڤیلهێلم ئولسۆنم.

من حەزم دەکرد، هەر هیچ نەبێ و بە لای کەمەوە هەمووی بۆ بێنکا باس بکەم. من و بێنکا هەمیشە پێکەوە یاریمان دەکرد. ئەویش هەر لە ئوپلاندسگاتان دەژی. ڕاستییەکەی ئەو (بێنگت)ی ناوە، بەڵام هەر بە بێنکا بانگی دەکەن. هەروەها، خۆ کەسیش من بە بو ڤیلهێلم ئولسۆن ناو نابا. هەر دەڵێن: بوسە. مەبەستم ئەوەیە بڵێم، هەر بوسەیان پێ دەوتم. ئێستە کە من ونبووم، ئیتر بە هیچ جۆرێ ناوم ناهێنن. تەنیا پوورە ئێدلا و مام سیکستن منیان بە بو ڤیلهێلم بانگ دەکرد. بەڵێ، ئەوی ڕاستی بێ مام سیکستن هیچی نەدەگوت و هەرگیز قسەی لەگەڵدا نەدەکردم.

من منداڵێک بووم و پوورە ئێدلا و مام سیکستن گرتبوومیانە خۆ، بەخێویان دەکردم. تەمەنم ساڵێک بوو کە هاتمە لایان. پێشتر لە خانەی منداڵانی بێکەس دەژیام. پوورە ئێدلا منی بردە لای خۆی. ڕاستییەکەشی ئەو بەتەمابوو کچێ بەرێ و بۆ خۆی پەروەردەی بکات، بەڵام جگە لە من کەس نەبوو، بۆیە ناچار منی برد. مام

سیکستن و پووره ئێدلا حەزیان لە چارەی کوڕان نایەت و خۆشیان ناوێن. هەر نەبێ، کوڕی تەمەن هەشت نۆ سالانیان ناچێ بەدڵدا. پێیان وایە، مال پڕی دەبێ لە هەرا و دەنگ و ژاوەژاو، منیش کە لە یاریگا دەگەڕامەوە کۆڵێ چڵک و پیس و پۆخلیم بەخۆمەوە دەبردە مالەوە و جلەکانم بە دەوری خۆمدا پەرت و بلاو دەکردەوە و فڕێم دەدان، بەمەشەوە نەدەوەستام و بە دەنگی بەرز قسەم دەکرد و پێدەکەنیم.

پووره ئێدلا هەموو کاتێ دەیگوت، چ ڕۆژێکی شووم بوو، ئەو ڕۆژەی من پێم نایە مالەکەیان! مام سیکستن هیچی نەدەگوت، جارجارێ نەبێ دەیگوت:

ـ هۆ کوڕە تۆ، سەر هەلبگرە و بڕۆ، ون بە لەبەر چاوم!

هەر بۆیە من زۆربەی کات لای بێنکا بووم. باوکی بێنکا دایمە قسەی لەگەل دەکرد و یارمەتیی دەدا کە مۆدێلی فڕۆکە دروست بکات و لە دەرگای موبەقەکەش خەتی دەکێشا بۆ ئەوەی بزانێ بێنکا چەندێ بالای بەرز بووە و لەم بابەتە شتانە... بێنکا بە ئارەزووی خۆی و چەندێ تاقەتی هەبووایە قسەی دەکرد، پێدەکەنی و جلەکانی بەدەوروبەریدا فڕێ دەدا، لەگەل ئەمانەشدا باوکی هەر خۆشی دەویست. هەموو مندالەکانیش بۆیان هەبوو بێنە لای و یاری بکەن. چ قورەت بوو، کەسێکیش سەر بە لای مندا بکا! چونکە پووره ئێدلا دەیوت بە خوا جوانە، مالەکەمان هەر ڕاکەڕاکە و فڕک و هووڕی مندالانی کەمە. مام سیکستنیش عەینەن بەزم بوو و دەیوت: بەچکەورچەکەی خۆمان سەر و زیادمانە.

جاروبار، که شەوانە دەچوومە ناو جێگا و ڕادەکشام، خۆزگەم دەخواست کە باوکی بێنکا باوکی منیش بووایە. هەر لە هۆڵی ئەوەشدا بووم و دەمپرسی کە داخۆ باوک و دایکی من کێن و بۆ من لای ئەوان نیم و دەمێ لە خانەی منداڵانی بێکەس و دەمێ لای ئەم پوور و مامەیە دەژیم. پووره ئێدلا پێی وتبووم کە دایکم بەسەر منەوە چووە و مردووە، دەشیگوت کەس نازانێ کێ باوکمە. بەڵام دیارە کە چ بەد و قوڕمساغێک بووە. من ڕقم لە پووره ئێدلا دەبۆوە کە ئاوای بە باوکم دەگوت. ڕەنگە وا بێ، دایکم بەسەر منەوە مردبێ، بەڵام دەزانم کە باوکم ئەو کابرا بەدفەڕ و قەڵبە نەبووە. جاروبار کە ڕادەکشام لەدووی دەگریام. تاقەکەسێ کە زۆر باش بوو لەگەڵمدا، پووره لوندین بوو، لە دوکانی میوە و سەوزەفرۆشی کاری دەکرد. جارناجارێ شیرینی و میوەی دەدامێ.

ئێستە، ئەوا دوای ئەمە، بیر دەکەمەوە کە دەبێ پووره لوندین کێ بێ، چونکە هەر لای ئەمەوە، ڕۆژی پانزەی ئۆکتۆبەر، ئەم بەسەرهاتە دەستی پێکرد. ئەو ڕۆژە پووره ئێدلا چەند جارێ دەیگوت و دەیگوتەوە، چ ڕۆژێکی شووم و پڕ نەهامەتی بوو کە من ڕووم کردە ماڵەکەیان. پێش سەعات شەشی ئێوارە پێی وتم کە بەپەلە بچم لەو نانەواخانەیەی درۆتنینگاتان ئەو جۆرەکەی بۆ بکڕم کە حەزی لێیەتی. کلێتەسوورم کردە سەر و فڕکەم کردە دەرەوە و ملی ڕێگام گرت.

هەر کە گەیشتمە دوکانی میوە و سەوزەکە، پووره لوندین لە



دەرگاکـەدا، ڕاوەسـتـابوو. بـاوەشی پێـدا کـردم و نووسـانـدمی بە سنگییەوە. ماوەیەکی زۆر سەیری کردم و دوایی وتی:

ـ حەز دەکەی سێوێکت بدەمێ؟

وتم: بەڵێ، سوپاس. سێوێکی سووری جوانی دا پێم، ئەوەندە جوان بوو، هەر نەبێتەوە. دواییش وتی:

ـ ئەو کارتەم بۆ دەخەیتە سنووقی پۆستەکەوە؟

وتم: بەڵێ بەسەر چاو، ئەی بۆ نا. دوایی چەند دێڕێکی لەسەر کارتەکە نووسی و دەستی بۆ درێژ کردم و دای پێم.
پووره لوندین وتی: خوات لەگەڵ بو ڤیلهێلم ئولسۆن... بە دوعا بو ڤیلهێلم ئولسۆن.
ئەوەندە جێی سەرنج بوو بەلامەوە. ئەو جاران لە بوسە زیاتر بە هیچی تر ناوی نەدەبردم.
بەرەو سنووقی پۆستەکە تەکانم دا، کە ڕیزەخانوویەک لەولاترەوە بوو. یەکەوڕاست، کاتێ ویستم کارتەکە فڕێ بدەمە سنووقەکەوە، بریسک و شەوقێکی وەک ئاگری دەدایەوە. ئا، پیتەکانی پووره لوندین وەک بە ئاگر نووسرابن، دەبریسکانەوە. نەمتوانی نەیخوێنمەوە. لە کارتەکە ئەمە نووسرابوو.
بۆ پاشا لە وڵاتی دوور
ئەوەی لەمێژە بەدوایدا وێڵی، بەڕێوەیە. شەو و ڕۆژ وچان نادا و ڕێگا دەبڕێ. نیشانەیەکیشی بەدەستەوەیە. سێوێکی ئاڵتوونیی یەکجار بریسکەدار و نایابە.
لە تەنیا وشەیەکی چییە تێنەگەیشتم. بەڵام لەرزێکی وا دایگرتم، لەوە بوو بکەومە دانەچۆقە. بەپەلە کارتەکەم هاویشتە سنووقەکە.
کێ بوو ئەوەی شەو و ڕۆژ بەڕێوە بوو؟ ئەی کێ سێوێکی ئاڵتوونیی بەدەستەوە بوو؟
دوایی سەیرێکی ئەو سێوەم کرد کە پووره لوندین پێی دابووم. سێوەکە لە ئاڵتوون بوو. من دەڵێم، هەر بەڕاست، سێوێکی

ئاڵتوونی بوو. من سێوێکی زێڕێنی بریسکەدارم بەدەستەوە بوو.
هەر لەوە بوو بدەمە پرمەی گریان. بەتەواوی نا، بەڵام خەریک بوو بگریم. ئەوەندە خۆم تەنیا هاتە پێش چاو، ئەوەندەم هەست بە تەنیایی کرد. ڕۆیشتم و لەسەر یەکێ لە کورسییەکانی یاریگاکە دانیشتم. لەوێ کەس، هیچ کەسێکی لێ نەبوو. هەموو چووبوونەوە بۆ ئەوەی نانی نیوەڕۆ بخۆن. باغچەکە تاریک بوو. نمنمیش باران دەباری، بەڵام ڕۆشنایی خانووەکانی دەوروبەر ئەو ناوەی کردبووە چراخان.
دەمبینی کە پەنجەرەکەی بێنکاش ڕووناک بوو. دیاربوو، لەگەڵ دایک و باوکیدا، خەریکی نانخواردن بوو. دەمزانی، لە هەموو ئەو ماڵە ڕۆشنانەدا منداڵەکان لەگەڵ دایک و باوکیاندا دانیشتبوون. تەنیا من بووم، هەر خۆم بووم لەو تاریکییەدا دانیشتبووم. تەنیا، تەنیا خۆم و سێوە زێڕینەکەم و نەمدەزانی چ ڕێگەیەک بگرم، بۆ کوێ سەری خۆم هەڵگرم؟
سێوەکەم لە نزیک خۆمەوە دانا و کەوتمە بیرکردنەوە. لەو نزیکانە، چراوگێک دەسووتا و شەوقەکەی زۆر بە هێز و تەوژم دەیدا لە من و سێوەکە، هەروا لە شتێکی تریش کە لەسەر زەوییەکە کەوتبوو. ئەوە شووشەبیرەیەکی ئاسایی بوو. تێدەگەی، بەتاڵ بوو! کەسێک بە پارچەدارێک سەرەکەی قەپات کردبوو. دیارە یەکێک لە منداڵەکانی تێگنێرلوند بووە، کە پاش نیوەڕوان لەوێ یاری دەکەن. شووشەکەم هەڵگرت و کاغەزی مارکەکەیم خوێندەوە، لێی نووسرابوو کارگەی



لەو کاتەدا بینیم، شتێک لەناو شووشەکەدا
خۆی دەبزێوێ و دەجوولێتەوە.

بیرەی ستۆکهۆڵم. ئەوە دانیشتووم و ئەمە دەخوێنمەوە، بینیم کە شتێک لەناو شووشەکەدا خۆی دەبزێوێ و دەجوولێتەوە.
جارێکیان لە کتێبخانە، کتێبی "هەزارویەک|شەوە"م وەرگرت و خوێندمەوە، باسی ئەوەی تێدا بوو، کە جارێک لە شووشەیەکدا جنۆکەیەک حەپس دەکرێ. بەڵام ئەوە لەو عەرەبسانە دوورە و پێش هەزاران ساڵ لەمەوبەر بووە، شووشەیش، شووشەی بیرەی ئاسایی و هی کارگەی بیرەی ستۆکهۆڵم نەبووە.
لەوە ناچێ شتی وا ببێ، چەند جنۆکەیەک هەبن لە شووشەی وادا. بەهەرحاڵ، لێرە وا دانەیەک هەیە. جنۆکە بوو، جنۆکە. هەر چۆن من وتم ئاوا... لە شووشەکەدا بوو، وا دیار بوو دەیویست بێتە دەرەوە. بە چاوێکی پڕ داوای بەزەییەوە لێی ڕوانیم و ئاماژەی پارچەداری سەری شووشەکەی کرد. من قەت خۆشیم لە جنۆکە نەدەهات، زۆریش دەترسام کە پارچەدارەکە لە شووشەکە دەربهێنم. بەڵام لەدواییدا زاتم نایە بەر خۆم و دەرمهێنا. جنۆکەکە بەخێرایی بازی دایە دەرەوە، هەر گەورە و گەورەتر دەبوو... تا وای لێهات لە هەموو خانووەکانی دەوروبەری تێگنێرلوند گەورەتر و بەرزتر بوو.
جنۆکە دەتوانێ خۆی وا بهێنێتەوە یەک و بچووک بکاتەوە، کە لە شووشەیەکدا جێگەی خۆی بکاتەوە، دوای سانیەیەک و لەچاوتروکانێکدا ئەوەندەی خانوویەکی گەورە خۆی گەورە بکات.
کەس ناتوانێ باوەڕ بکا، کە من چ ترسێکم لێ نیشت.

هەموو گیانم هاتبووە حەشۆکە و لەرزین. جنۆکەکە قسەی بۆ کردم، دەنگەکەی لە قیرەیەکی زل دەچوو، بەخەیاڵمدا هات، کاشکی پوورە ئێدلا و مام سیکستن ئەم دەنگەیان بەر بای گوێ بکەوتایە... چونکە ئەوان پێیان وایە، مرۆڤ قەت نابێ بە دەنگی بەرز قسە بکا.

جنۆکەکە پێی وتم: منداڵەکە، تۆ لەو حەپسخانەیە منت ئازاد کرد، خۆت بڵێ چۆن پاداشتت بدەمەوە؟

من هیچ پاداشتێکم بۆ ئەو پارچەدار دەرهێنانە نەدەویست. جنۆکەکە وتی، کە ئەو دوێنێ ئێوارە گەیشتۆتە ستۆکهۆڵم و خۆی خزاندۆتە شووشەکەوە بۆ ئەوەی سەرخەوێ بشکێنێ. جنۆکەکان لایان وایە، شووشە باشترین جێگای نووستنە. بەڵام کاتێ جنۆکەکە نووستبوو، کەسێک سەری شووشەکەی قەپاتکردبۆوە و ئەمیش ڕێی هاتنەدەرەوەی لێ گیرابوو. ئەگەر من بەرەڵام نەکردایە، دەبوو هەزاران ساڵ لەوێدا بەندبووایە، تا پارچەدارەکە دەڕزی.

جنۆکەکە لەبەرخۆیەوە دەیگوت: لەوانە بوو ئەمە بۆ پاشام خۆش نەبووایە، لەوەش زیاتر بۆ خۆشم ناخۆشتر.

ئیتر من زاتم نایە بەر خۆم و پرسیم:

ـ جنۆکە، تۆ لەکوێوە دێیت؟

دوای چرکەیەک تەواو کشوماتی، جنۆکەکە وتی:

ـ من لە وڵاتی دوورەوە هاتووم.

ئەوەندە بە دەنگی بەرز وتی، لە مێشکمدا زایەڵەی دەهات و دەزرنگایەوە، شتێکی وەهاش لە دەنگەکەیدا بوو، کە خستمیە سەر

تاسـه و ئارەزووی بینینی ئەو وڵاتە. وام هەست دەکرد، ئەگەر ڕێم لەو وڵاتە نەکەوێ و نەیبینم تەمەنم بەزایەدەچێ. باسکم ڕووبەڕووی جنۆکەکە بەرزکردەوە و هاوارم لێکرد:

ـ بمبـە لەگـەڵ خـۆتدا! هۆ، بمبە لەگـەڵ خـۆتدا بۆ ئەو وڵاتە دوورە! لەوێ کەسێ چاوەڕێمە.

جنۆکـەکـە سـەرێکی بادا، بەڵام هەر کـە سـێـوە زێڕینەکـەی ناو دەستمم نیشان دا، جنۆکەکە بە دەنگێکی زۆر بەرز قریشکاندی:

ـ تۆ نیشـانەکەت بەدەسـتـەوەیە! تۆ ئەو کەسـەی من هاتووم لەگەڵ خـۆمت بەرم. تۆ ئـەو کـەسـەی پاشـام دەمـێکە بەدواتـدا وێڵـە و لێت دەگەڕێ.

خـۆی نووشـتـاندەوە و بەرزی کردمـەوە و گرتمیە باوەش. کـاتێ ڕووە و ئاسـمـان بووینەوە، لەوە دەچوو گـۆرانی بە باڵامـاندا بـووترێ و ئاوازەشی دەدایەوە. ئێمە ئەوەندە بەرزبووبووینەوە تێگنێرلوند گەلێ لەژێرمـانەوە بـوو. ئەو تێگنێـرلونده و هەمـوو ئەو مـاڵە تاریکـانەی پەنجەرەکانیان شـەوقیـان دەدایەوە، لەوێ کە منداڵان لەگەڵ دایک و باوکیاندا خەریکی خواردنی نانی نیوەڕۆ بوون، بەڵام من بو ڤیلهێلم ئولسۆن لەژێر ئەستێرەکاندا پەلم دەهاویشت و دەفڕیم.

ئێـمـە لە سـەروو هەورەکـانەوە بووین و لە برووسـکە تیـژڕەوتر و لە هەورەگـرمـە دەنگمـان بەناڵەناڵتـر بوو. ئەسـتـێرە و مـانگ و ڕۆژ لە دەوروبەرمـان بـڵاچەیان دەهات و دەبریسکانەوە. جـارجـار هەمـوو شـتـێ وا تـاریک تاریک دادەهات دەتـگوت شـەوە، تاوتاویش ئەوەندە ڕۆشن و پرشنگدار بوو، دەبووایە چاوم بنووقاندایە.

منیش لەبەرخۆمەوە چپە و ورتەم دەهات، لە کارتەکە نووسرابوو، ئەوەی شەو و ڕۆژ بەڕێوەیە.

جنۆکەکەش ڕێک و ڕاست دەستی درێژ دەکرد و ئاماژەی شوێنێکی دووری دەکرد، شوێنێکی سەوز، کە لە ئاوێکی ڕوونی شیندا و لەبەر تیشکی بەهێزی خۆردا ڕاکشابوو.

جنۆکەکە وتی: ئەوەتا ئەوە وڵاتی دوورە. ئێمە بەرەو ئەو سەوزاییە شۆڕدەبینەوە.

ئەوێ دوورگەیەک بوو لەدەریادا مەڵەی دەکرد.

هەواش پڕ بۆن و بەرامەیەکی وا بوو، وەکو ئەوەی هی هەزاران گوڵەباخ و سۆسەن بێ، مۆسیقایەکی سەیر و خۆشی واش، بەر بای گوێ دەکەوت کە لە هەرچی مۆسیقای دنیا هەیە بەجۆش و شیرینتر بوو. لەخوارەوە، لە کەناری دەریادا، کۆشکێکی سپی گەورە هەبوو، ئێمە لەوێ نیشتینەوە.

کەسێک بەکەنارەکەدا بەرەو لای ئێمە دەهات، ئەمە پاشای باوکم بوو، هەر کە بینیم یەکسەر ناسیمەوە، زانیم کە ئەمە باوکمە، باسکی بۆ واڵاکردمەوە و منیش خۆم فڕێدایە باوەشی. ماوەیەکی زۆر بەخۆیەوە نووساندم. لەو ساتەدا هیچمان لەگەڵ یەک نەگوت. منیش بە هەموو هێزی خۆمەوە باوەشم کردبوو بە ملیدا.

ئاخ، چەند حەزم دەکرد پوورە ئێدلا پاشای بابمی بدیایە، کە چەند قژە و جلەکانی چۆن لە ئاڵتوون و ئەڵماسدا دەبریسکێنەوە. دەموچاوی هەر لە باوکی بێنکا دەچوو، ئەم جوانتریش بوو. مخابن!



که پووره ئێدلا نایبینێ، ئەگەر بیدیایە ئەوسا دەیزانی کە باوکم ئەو کابرا قەڵب و بلحە نییە.

بەڵام پووره ئێدلا ڕاستی دەکرد کە دایکم بەسەر منەوە مردبوو. ئەو مرۆڤە گەوجانەی خانەی منداڵانی بێکەسیش قەت بیریان لەوە نەکردبۆوە کە خەبەر بدەنە باوکم و بڵێن من لەوێم. ئەم نۆ ساڵان بە شوێن مندا گەڕابوو. من ئەوەندە دڵخۆشم هەر نەبێتەوە، کە ئاخرێکەی لەگەڵ باوکمدا بە یەکتر شادبووینەوە.

ئەوە ماوەیەکی زۆرە من لێرەم، ڕۆژانە دڵخۆشم، هەموو ئێوارەیەکیش پاشای بابم دێتە ژوورەکەم و بەیەکەوە مۆدێلی فڕۆکە دروست دەکەین و دەمەتەقێ دەکەین.

من گەورە دەبم و لەم وڵاتی دوورە زۆر کامەرانم. باوکیشم هەموو مانگێک لە دەرگای موبەقەکە خەت دەکێشێ، بۆ ئەوەی بزانێ چەندێ درێژبووم و هەڵمداوە.

باوکم کاتێ دەمپێوێ دەڵێ: میۆ... میۆکەی من، نامەخوا تۆ باڵات بەرز بووە. هەموو دەوربەرەکەم نیشانی دەدەن، من قەت ناوم بوسە نەبووە.

ـ نۆ ساڵی ڕەبەق من لەدووت دەگەڕام. بابەپاشام دەڵێ: شەوانە بە بێداری ڕادەکشام و بیرم دەکردەوە، میۆ... میۆکەی من، دەمزانی و دڵنیابووم تۆ ئەمە ناوتە.

من ئەوەندە بابەپاشـــام خـــۆش دەوێ، ئەوە هەرچی ئەوە، هەر مەپرسە،

کاشکی بێنکا هەموو ئەم شتانەی ئێرەی بزانیبایە. پێموایە دەبێ بۆی بنووسم و بیخەمە ناو شووشەیەک و بە پارچەدارێک سەرەکەی قـایم بکەم و فـڕێی بدەمـە ئەم دەریا شـینەی دەوروبەری وڵاتی دوورەوە. ڕەنگە، کە بێنکا لەگەڵ باوک و دایکیدا بچن بۆ خانووی هەواری هاوینەیان لە ڤاکسهۆلم، شووشەکە دەریا تەی بکا و بگاتە ئەو ئاستـەی ئەوان مەلەی لێ دەکەن. ئەگەر وا بووایە زۆر چاک دەبوو. زۆر خۆش دەبوو، کە بێنکا هەموو ئەم بەسەرهاتە خۆشانەی ژیانی منی بزانیبایە. ئەو کاتە دەیتوانی تەلەفوونێ بۆ بەشی ڕاگەیاندنی پۆلیس بکا و هەموو شتێکیان دەربارەی بو ڤیلهێلم ئولسۆن، کە ئێستا لەڕاستیدا ناوی میۆیە، پێ ڕابگەیەنێ و پێشیان بڵێ ئەو لە وڵاتی دوور زۆر باشە و خۆشی دەباتە سەر و لای پاشای بابیەتی.

# له باخی گوڵاندا

ئەگــەرچی بەتەواوی نازانم، چۆن بۆ بێنکای بنووسم. ئەوەی من دیومە و بەسەر من هاتووە، شتی وا نەبووە و لە کەس ڕووی نەداوە. هەر ناشــزانم چۆن بۆ بێنکای باس بکەم تا تێ بگات و بە چاکی حاڵی ببێ. بیرم لە وشەیەک کردۆتەوە بتوانم بۆی بنووسم بەڵام وشەیەکی وا نابینمەوە. ڕەنگە بمتوانیایە بمنووسیایە: ئەوەی من دیومە دەگمەن و قەت نەبینراوە. دوای ئەوساش خۆ بێنکا هەر نازانێ و تێ ناگا چی لەم وڵاتی دوورە هەیە و چۆنە. ئەگەر بمەوێ هەمــووی بۆ بنووسم، ئەوا بەلای کەمــەوە، پێــویســتم بە دەرزەنێ شووشە دەبێ، تا باسی باوکم و باخی گوڵان و، یوم ـ یوم و ئەسپە سپییە جوانەکەم ـ میرامیس و کاتۆ ئەو سوارە ترسناک و دڕندەیەی بۆ بکەم، کە لە وڵاتێکی نزیکمــان دەژی. نەخێــر، قەت ناتوانم و دەڕۆســتی ئەوە نایەم چیم دیوە و تیــایدا ژیاوم باسی بکەم.

هەر یەکەم ڕۆژ باوکم منی برد بۆ باخی گوڵان. پاش نیوەڕۆ بوو، با گەڵای دارەکانی خستبووە لەرە و لەرزە. کاتێ کە لە باخەکە نزیک بووینەوە، مۆسیقایەکی یەکجار سەرنجڕاکێشم بیست. وەکو ئەوەی لە یەک کاتدا هەزار زەنگی لە شووشە دروستکراو پێکەوە لێبدرێن. مۆسیقاکە بەئاستەم دەبیسترا و لە هەمان کاتیشدا ئەوەندە کاریگەر بوو، مرۆڤی دەخستە دڵەکوتە.

باوکم وتی: گوێت لە سپیی چنارە زیوینەکانمە، کاتێ دەڕۆیشتین باوکم دەستی گرتبووم. پوورە ئێدلا و مام سیکستن قەت دەستی منیان نەدەگرت، هیچ کەسێکی دیش پێشتر دەستی منی نەگرتبوو. هەرچەندە من لەوە دەرچووبووم و گەورە بووبووم و پێویستم بە دەستگرتن نەبوو، بەڵام کۆلێکیشم پێ خۆش بوو کە دەستی بابەشام بگرم و لەو ناوەدا بگەڕێم.

شوورەیەکی بەرز بە دەوری باخەکەدا کرابوو. باوکم دەروازەیەکی بچووکی کردەوە و چووینە ناوەوە.

جارێکیان، زۆر لەمەوبەر، لەگەڵ بێنکا چووین بۆ ماڵە هاوینەکەی ئەوان لە ڤاکسهۆلم، لەسەر تاشەبەردی قەدپاڵی شاخێک دانیشتبووین و بە ڕاوەماسییەوە خەریک بووین، ئەوکاتە خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو. ئاسمان بەتەواوی سوور هەڵگەڕابوو، ئاوەکەش زۆر مەند و ئارام بوو. ئەوە وەختی پشکوتنی گوڵەباخی کێوی بوو. ئەوەندەش زۆر غونچە لە پشت ئەو تاشەبەردەوە هەبوو، هەر نەبێتەوە. تاقتاقکەرەیەکیش دوور لەوبەری کەنداوەکەوە، وا بەرز دەیخوێند، لەبەرخۆمەوە بیرم دەکردەوە و دەموت، کە ئەمە شیرینترین شوێنی دنیایە. بێگومان من تاقتاقکەرەکە خۆیم نەدەدی، دەنگەکەی ئەویش شتەکانی ئەو ناوەی لە هەموو شتەکانی شوێنانی تر جوانتر و نایابتر کردبوو. من هێندە بێعەقڵ نەبووم کە شتێکم بە بێنکا وت، بەڵام هەموو وەختەکە بە بێدەنگی بیرم دەکردەوە: ئا ئێرە جوانترین شوێنی دنیایە.



بەڵام ئەوسا من هێشتا باخەکەی بابەشامم نەدیبوو. هێشتا هەموو گوڵەباخە جوانەکانیم نەدیبوو، کە وەک بەدەم باوە شەپۆلان بدەن وا بوون، یان گوڵە سۆسەنە سپییەکانی کە بۆ با دەشنانەوە. من چنارەکانیم نەدیبوو، کە گەڵاکانیان زیوین بوون، وەها بەرزیش بە ئاسماندا هەڵچووبوون، کە هەر ئێوارە دادەهات ئەستێران بەسەر سەریانەوە دەگەڕان و دەدرەوشانەوە. من باڵندە سپییەکانیم نەدیبوو، کە بەناو گوڵەباخەکەدا دەفڕین و هەرگیزیش دەنگی خۆشی وەک ئاوازەی ئەوان و ئاوازەی گەڵای دارچنارەکانم

نەبیستبوو. قەت کەسێک و هیچ کاتێک ئەوەی نەدیوە و نەبیستووە، کە من لە باخەکەی باوکمدا بەر گوێم کەوت و بینیم. بەئارامی ڕاوەستابووم و دەستی باوکمم گرتبوو. حەزم دەکرد، هەست بکەم تەنیا نیم و ئەویش لەوێیە، بە ئەوەوە ئەو ناوە هێندە جوان بوو، کە مرۆڤ نەیدەتوانی بەتەنیا ڕاوەستێ و تێی بڕوانێ. باوکیشم دەستێکی دا لە ڕوومەتم و وتی:

ـ میۆ، میۆکەی من، حەزت لە باخی گوڵانە؟

لەخۆشیدا هەستێکی ئەوەندە سەیر دایگرتبووم، خەریک بوو وەڵامم بۆ نەدرێتەوە، لەوە دەچوو وەکو ئەوەی خەمبار بم، بەپێچەوانەشەوە نەک هەر خەمبار نەبووم، بەڵکو زۆر دڵیشم خۆش بوو... خەریک بوو من خۆم بە باوکم بڵێم، زەینی بۆ ئەوە نەچێ کە من خەمبارم، پێش ئەوەی من دەم بکەمەوە و بێمە گۆ، ئەو وتی: زۆر چاکە، وا دڵخۆشی... هەر ئاوا بەردەوام بە...

دوایی چوو قسە لەگەڵ باخەوانەکەیدا بکات، کە لەوێ وەستابوو و چاوەڕێی ئەمی دەکرد. منیش بۆ خۆم بە هەموو لایەکدا هەڵدەبەزیمەوە و سەیرم دەکرد. ئەم هەموو جوانییەی ئەوێ سەرسامی کردبووم، هەموو لەشم لێوانی موچڕکە و تەزووی خۆشی بوو. قاچەکانم ئەوەندە بەگوڕ و باسکەکانم هێندە بەهێز بوون ئاگای وەستانم نەدەزانی. حەزم دەکرد بێنکاش لەوێ بووایە، تا بتوانم شەڕەشەقی لەگەڵدا بکەم، بێگومان تەنیا بۆ یاریکردن و هیچی تر. چونکە من پێویستم بە هاوتەمەنێکی خۆم بوو، کە

هاوبەشی ئەم هەموو شتەی ئێرەم بێ. بەڵام بێنکای بەستەزمان، ئا ئێستا دیارە لە تێکنێرلوندە و وەک جارانیش ئەوێ هەر پرووشە و با و بارانە و تاریک و ماتە. حاڵبووکی ئەو دەشزانێ و لای ڕوونە، کە من ون بووم و ناشزانێ بەرەو کوێ ملی ڕێگام گرتووە و بیریش لەوە دەکاتەوە ئاخۆ دەمبینێتەوە یان نا، ئۆی بێنکای کەساس! من و بێنکا ئەوەندە خۆشمان بەیەکەوە دەبردەسەر. کە لە باغچەکەی بابەشامدا ڕێم دەکرد غەریبی ئەوم کرد. من لەو هەموو شتە کۆنانەی ڕابووردن، تەنیا لە بێنکام کەمە و بیری ئەو دەکەم.



ڕاستییەکەشی کەسێکی تر نییە، کە لێی بڕابم. با، ڕەنگە پوورە لوندینیش، چونکە هەمیشە لەگەڵمدا میهرەبان و چاک بوو. بەڵام زیاتر لە هەمووش لە خولیای بێنکادا بووم. بە بێدەنگی بە ڕێچکەیەکی پێچاوپێچی بچکۆڵەی باخەکەدا ڕێم دەکرد، وەک ئەوەی ئەو هەموو تەزووی خۆشییەی دایگرتبووم لەشم جێ بهێڵێ، تۆزێ وەڕس بووم، سەرم نەوی کردبوو، ڕێم دەبڕی، لەناکاو سەرم هەڵبڕی و سەیرم کرد لە کۆڵانەکەدا بەرانبەرم وەستابوو. ئا، من وامزانی ئەوە بێنکایە. بەڵام ئەو نەبوو. ئەوە یوم - یوم بوو.



ئاشکراشـە، ئەو کـاتە، نـەمدەزانـی ناوی یوم - یومـە، کـوڕێک بوو، عەینەن بێنکا قژی قاوەیی تۆخ و چاویشـی هـەر قاوەیی بوو.

ـ تۆ کێیت؟

ـ من (یوم-یوم)م.

دوایی بینیم بەهەرحـاڵ تۆزێ لە بێنکا نەدەچوو. بە شـێواز جـددی و کوڕی چاکتر لە بێنکا خۆی دەنواند. بێگومان بێنکـاش کوڕی چاکە و ئێـمـە تـەقریبـەن وەکـو یەک بووین، نە زۆر هـاروهـاج و نە زۆریش گوێڕایەڵ بووین، لەگـەڵ ئـەوەشـدا جـاروبار پـێکدا هـەڵدەشـاخـاین و شــەڕمــان دەبوو. تۆزێ لـە یەکــتــر زویر دەبووین، دوایی ئـاشت دەبووینەوە و وەک برادەرەکـەی جـارانمان لـێ دەهـاتەوە. بەڵام یوم - یوم کـوڕی ئـەوە نـەبـوو قـەت مـرۆڤ لەگـەڵی بەشــەڕ بێت. ئەو نـازک و لەوەش میهرەبانتر بوو کەڵکی شـەڕی پێوە بێت.

من وتـم: دەتەوێ بزانـی من نـاوم چییە، من نـاوم بوسـەیە... نـەء، ئەوە وەک ئەوە وایە، نـاوم میۆیە.

یوم-یوم وتـی: دەزانـم کـە تۆ میۆت نـاوە، پـاشـامـان هـەواڵی بـە هـەموو لایەکی وڵاتدا ڕاگەیاندووە، کە میۆ گەڕاوەتەوە بۆ ماڵ.

تۆ ســەیری کــە! بـابەشــام ئەوەنـدە دڵخـۆش بـووە بەوەی کــە مـنـی دۆزیوەتەوە، هـەواڵی بە هـەمـوو لایەکی وڵات کــەیاندووە. هـەرچەنـدە کـارێکی تۆزێ منـاڵکارانـەشـە لەلایەن ئەوەوە، بەڵام مـن بە بیسـتنی زۆر دڵشـادبووم.

من پرسـیم: تۆ باوکت هـەیە یوم-یوم، ئومێدەواربووم و حـەزم دەکرد

کە هەیبێ، چونکە من خۆم ماوەیەکی دووروودرێژ بێباوکیم چەشتبوو و، دەمزانی بێباوکی چەند تاڵ و ناخۆشە.

- ئەی چۆن، من باوکم هەیە. باخەوانەکەی پاشای خودانی مە باوکی منە. حەز دەکەی لەگەڵمدا بێیت و بزانی من لە کوێ دەژیم؟

وتم، ئا حەز دەکەم و ئەو لەپێش مندا بە ڕێچکە پێچپێچەکەی باخەکەدا، تا لای گۆشە دوورەکەی سەری ئەوسەری باخی گوڵان ڕایکرد. لەوێ خانوویەکی سپیی بچکۆلەی لێ بوو، سەرەکەی لە پووش و پەڵاش بوو، هەر لە خانووی ڕازە ئەفسانەییەکان دەچوو. ئەوەندە گوڵەباخ بە دار و دیوار و سەری خانووەکەوە ڕوابوو، پیاو بەئاستەم شتێکی لە خودی خانووەکە دەدی. پەنجەرەکان کرابوونەوە، باڵندە سپییەکان بە ئارەزووی خۆیان فڕک و هووڕی دەر و ژووریان بوو. لە لایەکی خانووەکەوە کورسی و مێزێکی لێ دانرابوو. هەروەها ڕیزێک کوورەهەنگی لێ بوو، هەنگەکان بەناو گوڵەباخەکاندا گیزەگیزیان بوو. ئەو ناوە هەمووی گوڵەباخ و سپیی چنار و بیی کەلا زیوین بوو، یەکێک لە موبەقەکەوە هاواری کرد:

- یوم-یوم، نانی ئێوارەت لەبیرچووە؟

ئەوە دایکی یوم-یوم بوو کە بانگی کرد، هاتە دەرەوە بۆ ئاستانەی ماڵەکە، وەستا و دایە قاقای پێکەنین. دوایی سەیرم کرد، کە ئەو هەر بەتەواوی لە پوورە لوندین دەچوو، دیارە کەمێ جوانتر بوو. وەلێ، ئەمیش لە گۆنا خرپنەکانیدا چاڵی قووڵی وەکو ئەوانەی پوورە لوندینی هەبوو، هەروەک ئەویش باوەشی پێدا کردم، وەک ئەو جارەی کە وتی:



ـ خوات لەگەڵ، بو ڤیلهێلم ئولسۆن.

بەڵام دایکی یوم-یوم وتی:

ـ ڕۆژباش، ڕۆژباش میۆ! حەز دەکەی پێکەوە لەگەڵ یوم-یومدا نانی ئێوارە بخۆی؟

ـ بەڵێ سوپاس، ئەگەر زەحمەت نییە.

ئەو وتی: نە ئەرکە و نە هیچ. لای پێشی خانووەکەوە یوم-یوم و من لەسەر مێزەکە دانیشتین. دایکی هات و قاپێکی گەورە شلکێنە، شیر و مرەبای شلیکی هێنا. یوم-یوم و من ئەوەندەمان خوارد،

هەر مەپرسە. لەوانە بوو شەقبەرین. سەیری یەکترمان دەکرد و پێدەکەنین. من زۆر دڵم بەوە خۆش بوو، کە یوم-یومیش لەوێ بوو. یەکێ لە باڵندە سپییەکان بە باڵەتەپە شۆڕبۆوە و لە قاپەکەی من لەتە شلکێنەیەکی فڕان و فڕی، ئیتر من و یوم-یوم ئەوەندەی تر پێکەنین.

لەو کاتەدا بابەشا و باخەوانەکەی، کە باوکی یوم-یوم بوو، پێکەوە بەرەو لای ئێمە دەهاتن. لەپڕدا من شڵەژام و مات بووم، نەوا بابەشام حەزنەکا کە من لەوێ دانیشتووم و نان دەخۆم، هەر بەمەشەوە نەوەستاوم و قاقا پێدەکەنم. چونکە هێشتا بەتەواوی نەمدەزانی، کە بابەشام چەند باشە و چەند منی خۆش دەوێ. هەرچییەکیش بکەم، چەند حەز دەکا و لەدڵەوە دەیەوێ کە من پێبکەنم.

بابەشام کە منی دی وەستا.

- میۆ، میۆکەم لێرە دانیشتوویت و پێدەکەنی.

من وتم: بەڵێ، ببوورە. چونکە من وامدەزانی بابەشاشم هەروەک مام سیکستن و پوورە ئێدلا خۆشییان لە تریقەی بەرزی پێکەنین نایەت.

بابەشام وتی: زیاتر پێ بکەنە. دوایی بەلای باخەوانەکەدا وەرچەرخایەوە و شتێکی سەیری پێ وت.

- من حەزم لە خوێندنی باڵندەیە. حەزم لە ئاوازەی مۆسیقای چنارە زیوینەکانمە. بەڵام لە هەموو شتێ زیاتر حەزم لەوەیە لە باخەکەمدا گوێم لە پێکەنینی کوڕەکەم بێ.



ئەوسا بۆ یەکەم جار تێگەیشتم کە قەت پێویست ناکات لە بابەشام بترسم و هەرچییەکیش بکەم، ئەو هەر بە چاوی خۆشەویستییەوە وەک ئێستا سەیرم دەکات. بە هەمان خۆشەویستیەوە کە لەوێدا وەستابوو دەستی لەسەر شانی باخەوانەکەی بوو تێمدەڕوانێ، ئەو هەموو باڵندە سپییانەش بە دەوری خۆیاندا بە شەقەی باڵ دەسووڕانەوە. کاتێ ئەمەشم زانی، بە جۆرێ دڵم شاد بوو کە هەرگیز جارێک لە ژیانمدا شتی وەهام بەخۆمەوە نەدیبوو. من ئەوەندە دڵخۆش بووم، کە پێویست بوو هەر یەکجار زۆر پێ بکەنم. سەرم بە پشتا خست و، بە جۆرێک پێکەنیم لەوەبوو باڵندەکان بسڵەمنەوە و بترسن. یوم-یوم پێی وابوو، کە من هێشتا هەر بەو

مەلە پێ دەکەنم کە لەتە شلکێنەی لە دەورییەکەم فڕاند، بۆیە ئەویش زیاتر سەرگەرمی پێکەنین بوو، بابەشام و باوکی یوم-یوم و دایکیشی هەر پێ دەکەنین. نازانم ئەوان بە چی پێ دەکەنین، تەنیا ئەوەندە دەزانم کە من خۆم بۆ بابەشام پێ دەکەنیم.

کاتێ لە نانخواردن بووینەوە، یوم-یوم و من وازمان دەستمان کرد بە ڕاکردن بەناو باخەکەدا و، تەپاوتلمان بەسەر گیاکەدا دەکرد و، لەپشت دەوەنەکانەوە خەریکی چاوشارکێ بووین. ئەوەندەی شوێنی خۆشاردنەوە تێدا بوو، ئەگەر دە یەکی ئەمە لە تێگنێرلوند و ئەو ناوەی دەوروپشتی هەبووایە، من و بێنکا زۆر پێی دڵخۆش دەبووین. مەبەستم ئەوەیە بڵێم، بێنکا دڵی خۆش دەبوو. من خۆم، خۆشبەختانە، تا ماوم قەت پێویستم بەوە نییە لە تێگنێرلوند بەدوای حەشارگەدا بگەڕێم.

تاریک داهات. تەمێکی نەرمی شین ئاسمانی باخی گوڵانی داگرت. باڵندە سپییەکان بێدەنگ بوون و بەرەو هێلانەکانیان گەڕانەوە. سپیچنارەکانیش کپ بوون. هەموو باخەکە ئارام و کش و مات بوو. بەڵام بە پۆپەی بەرزترین چنارەوە باڵندەیەکی تەنیای ڕەش و گەورە هەڵنیشتبوو و دەیخوێند. ئەو لە هەموو باڵندە سپییەکان خۆشتر دەیخوێند. پێم وابوو بۆ من دەخوێنێ، بەڵام حەزم نەکرد گوێی لێ ڕابگرم، چونکە بە جۆرێک دەیخوێند کە ئازاری دڵی دەدا.

یوم-یوم وتی: ئەوا ئێوارە و شەو داهات. من دەبێ بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە.

من وتم: نا، مەڕۆرەوە. چونکە نەمدەویست بە تەنیا لەگەڵ ئەو گۆرانییە سەیرەدا بمێنمەوە.

ـ یوم-یوم، ئەوە کێیە لەوێ! وام وت و ئاماژەی باڵندە ڕەشەکەم کرد.
یوم-یوم وتی: نازانم، من ڕاهاتووم پێی بڵێم باڵندەی خەم. هەر لەبەر ئەوەی ئەوەندە ڕەشە. لەوانەیە ناوێکی هەر تەواو جیای هەبێ.
من وتم: پێم وانییە، کە بچێتە دڵمەوە و حەزی لێ بکەم.
یوم یوم وتی: من خۆشم دەوێ، باڵندەی خەم چاوەکانی ئەوەندە دۆستانە و جوانن. شەوباش میۆ. وای وت و ڕایکرد.
هەر عەینەن وەخت، بابەشام هات. دەستی گرتم و پێکەوە بەناو باخەکەدا بەرەو ماڵ گەڕاینەوە، باڵندەی خەم لەسەر خوێندن بەردەوام بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دەستم لەناو دەستی بابەشامدا بوو، خوێندنەکەی ئەو ئازارەی نەدەدامێ، بەپێچەوانەوە حەزم دەکرد کە زیاتر و زیاتر بخوێنێ.
دواشت کە بینیم، پێش ئەوەی لە دەروازەکە ئاودیوبین، ئەوە بوو کە چۆن باڵندەی خەم باڵە ڕەشە گەورەکانی بەرز کردەوە و ڕێک بەرەو ئاسمان دای لە شەقەی باڵ، هەروەها بینیشم کە سێ ئەستێرەی بچکۆلە بە حەواوە دەستیان بە درەوشانەوە کردبوو.

# میرامیس

من حەز دەکەم بزانم، ئەگەر بێنکا ئەسپە سپییەکەی منی بەم یاڵە ئاڵتوونییەوە بدیایە، دەیگوت چی. میرامیسەکەم بە یاڵ و چوارپەلی زێڕینەوە. بێنکا و من ئەوەندە حەزمان لە ئەسپە. تەنیا بێنکا و پوورە لوندین ئاشنای من بوون کە لە ئوپلاندسگاتان دەژیام. من هاوڕێیەکی تریشم هەبوو. بیرم چوو باسی بکەم. ناوی کالەپونت بوو. کالەپونت، ئەسپێکی پیری کابرایەکی بیرەفرۆش بوو. هەفتەی دوو جار بیرەفرۆش بە خۆی و بارەکەیەوە دەهات بۆ دووکانەکانی ئوپلاندسگاتان. ئەو بەیانیان زوو دەهات، ئەو کاتانەی من دەچووم بۆ قوتابخانە، کردبوویشمە خوو کە تۆزێ لەگەڵ کالەپونتدا بدوێم. ئەسپێکی پیری هێندە چاک بوو و، من کلۆشەکر و وردەنانم بۆ کۆ دەکردەوە. هەروەها بێنکاش، چونکە بێنکاش کالەپونتی خۆش دەویست. ئەو دەیوت کالەپونت ئەسپی ئەوە، منیش دەمووت هی خۆمە. جاروبار لەسەر کالەپونت تێک دەچووین. بەڵام کاتێ بێنکا نەیدەبیست و ڕازی نەدەبوو، بە گوێی کالەپونتمدا دەچپاند: "بەهەرحاڵ، تۆ هەر ئەسپی خۆمی!" وام بە بیردا دەهات، کە لەوە دەچوو کالەپونتیش تێم بگات و ڕاشی هەروەک من وابێ. بێنکا باوک و دایکی هەبوو، لە هیچی کەم نەبوو، بۆیە ئەو ئەوەندەی کەسێکی تەنیا پێویستی بە ئەسپێک نەبوو. لەبەر ئەوە، لام وابوو،

دەبووایە کالەپونت ئەسپی من بووایە نەک هی بێنکا. ئەگەر مرۆڤ بیەوێ ڕاستییەکەی بڵێ، کالەپونت ئەسپی هیچ کاممان نەبوو، هی کابرای بیرەفرۆش بوو. ئێمە خۆمان دەخلافاند و وامان نیشان دەدا کە هی ئێمەیە. هەرچی من خۆمم، ئەوەندە شوولم لێ هەڵکێشابوو، ئەوەندەی نەمابوو بێمە سەر ئەو باوەڕەی کە هەر بەڕاستی ئەسپی من بوو. جاری وا هەبوو ئەوەندە زۆر کالەپونتم دەدواند، کە لە قوتابخانە دوادەکەوتم، کاتێ خانمەکەی مامۆستام لێی دەپرسیم، بۆ دواکەوتووم، نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە. پیاو نەیدەتوانی بە مامۆستا بڵێ، کە وەستاوم و قسەم لەگەڵ ئەسپەپیری بیرەفرۆشێک کردووە. هەندێ بەیانی کابرای بیرەفرۆش زۆر درەنگ دەکەوت بۆیە ناچار دەبووم بێ ئەوەی کالەپونت ببینم تا قوتابخانە ڕابکەم. من لە خاوخلیچکیی کابرا ئەوەندە پەست دەبووم، کە لەسەر کورسییەکی قوتابخانە دادەنیشم، لە ڕقاندا کلۆشەکر و وردەنانەکانی گیرفانم دەپرواند و وەڕزیی کالەپونتم دەکرد و پێم وابوو کە چەند ڕۆژێک دەخایەنێت تا چاوم پێی دەکەوێتەوە.

ئەوسا مامۆستا دەیوت:

ـ بوسە ئەوە ئاخ بۆچی هەڵدەکێشی؟

من هیچ وەڵامم نەدەدایەوە، ئەی گوایە چی جواب بدەمەوە؟ مامۆستا قەت ناتوانێ لەوە بگات، کە بەقەد چەندێ من کالەپونتم خۆش دەوێ.

ئێستا بەتەواوەتی بووە بە هی بێنکا بەتەنیا، دەیسەلمێنم و زۆر چاکیشە. ئەمە تەنیا بۆ بێنکایە، من لەوێ نیم، کالەپونتی هەیە و دەتوانێ بێتاقەتیی خۆی پێ دەرکا. خۆم من ئێستا میرامیسم هەیە بە یاڵ و چواریەلی زێڕینیەوە. ئەمەم چۆن دەست کەوت، ئاوا بوو. ئێوارەیەکیان کە من و باوکم خەریکی دروستکردنی مۆدێلی فڕۆکە بووین و دەمەتەقێمان دەکرد، وەک بێنکا و باوکی، من باسی کالەپونتم بۆ باوکم کرد.

ـ میۆ، میۆکەم، حەزت لە ئەسپە؟

ـ ئا، بێگومان. کە وتم لە قسەکەمدا وا دەرکەوت کە من یەکجار ئەوەندەش حەزم لە ئەسپ نییە، بەڵام هەر بۆ ئەوە بوو، بابەشام وا نەزانێ، کە من لای ئەو لە هیچ شتێکم کەمە.

بۆ سبەینێ بەیانی، کە گەیشتمە باخەکە، ئەسپێکی سپی بە غار بەرەو لام هات، قەتیش ئەسپێکی وا بەیەرغەم نەدیبوو، یاڵ و سمی زێڕینی لەبەر تیشکی خۆردا دەبریسکانەوە. ڕێک و ڕاست بەقەڵەمباز بەرەو لای من هات و بە شێوەیەکی ترسناک دەیحیلاند. هەرگیز حیلەی وام بەر گوێ نەکەوتبوو. ترسم لێ نیشت و خۆم لە بابەشام نزیککردەوە. بەڵام بابەشام بە دەستە قورسەکانی یاڵی ئەسپەکەی گرت، ئەویش یەکسەر لە جێی خۆی وەستا، دوایی لووتە نەرمەکەی ژەندە گیرفانم بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ هیچ کلۆشەکری تێدایە. کالەپونتیش هەر وای دەکرد. جا، بەڕاستیش گیرفانم کلۆشەکرێکی تێدابوو. دانەیەکم هەر بە یادی جاران هەڵگرتبوو. ئەسپەکە بردی و خواردی.



ـ میۆ، میۆکەی خۆم، ئەمە ئەسپی تۆیە و ناوی میرامیسە.
ئۆ، میرامیسەکەم، یەکەندەردوو خۆشم ویست. بەڕاستی جوانترین ئەسپی دنیا بوو، هیچیشی لەو کالەپونتە بەستەزمانە نەدەچوو، کە پیر و کەنەفت کەوتبوو. بە لای کەمەوە، من هیچ لەیەکچوونێکم لەنێوانیاندا نەدەدی. تا ئەو کاتەی میرامیس کەللە جوانەکەی بەرزکردەوە و بۆی ڕوانیم. ئەوساکە بینیم کە چاوەکانی هەر دەڵێی ئەوانەی کالەپونتن. چاوە بەوەفاکانی، ئەوانەی ئەسپ هەیانە.
من تەنیا جارێکیش لە ژیانمدا سواری ئەسپ نەبووبووم و غارم پێ نەکردبوو. بەڵام ئێستا وا بابەشام بەرزی کردمەوە و خستمیە سەر پشتی میرامیس.
من وتم: نازانم، ئاخۆ بوێرم.

بابەشام وتی: میق، میۆکەم، بۆچی غیرەتت نییە و دڵێکی نەترست نییە!

دوایی لغاوەکەی میرامیسم گرت و لەناو باخەکەدا تاوم دا. بەسواری بە ژێر سپی چنارەکاندا دەڕۆیشتم، کە گەڵا زیوینەکانی بەسەرمدا دەڕژان. تاوم دەدا، خێرا و خێراتر و خێراتر، میرامیسیش قەڵەمبازی بەسەر بەرزترین پەرژینی باخەکەدا دەدا. ئەوەندە سووک و چاک و جوان دەیکرد، تەنیا جارێک لە پەرژینەکە خشا و ڕێژنەیەک پەڕەی گوڵەباخی بەخۆیەوە هەڵوەراند.

خواوڕاستان یوم-یوم هات و بینی چۆن دەئاژۆم، دەستی کرد بە چەپڵەلێدان و هاواری کرد:

ـ میق غار بە میرامیس دەکا، میق میرامیس تاو دەدا.

ئیتر جڵەوی میرامیسم گرتەوە و لە یوم-یومم پرسی ئاخۆ دەیەوێ بێتە پاشکۆم، دیاربوو حەزی دەکرد، چاپووکانە خۆی فڕێ دایە سەر پشتی ئەسپەکە. لەو مێرگە سەوزانەی نزیکی باخەکەدا پیرەئەسپمان تاودەدا، ئەمە خۆشترین شت بوو کە لەژیانمدا دیبووم و کردبووم.

مەملەکەتەکەی بابەشام ـ وڵاتی دوور، ئەوەندە گەورەیە لە هەموو وڵاتێ گەورەترە.

لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکوور و باشووردا کێشمانی خۆی داوە و کشاوە. ئەو دوورگەیەی کە کۆشکەکەی بابەشامی تێدایە ناوی دوورگەی سەوزەمێرگانە، بەڵام ئەمە تەنیا شتێکی بچووکی، هەرەبچووکی، وڵاتی دوورە.



کاتێ بە مێرگەکانی نزیکی باخەکەدا غارمان دەکرد، یوم-یوم وتی:
ئەوبەری دەریاش و ئەودیوی چیاش سەر بە قەڵەمڕەوی خودانی مە، پاشایە.

کاتێ لەبەر تیشکی خۆردا بەرەو پێشەوە تاومان دەدا، بیرم لای بێنکا بوو. بەستەزمانە، بیهێنە بەر چاوی خۆت، ئێستا ئەو لەو کرێوە و تاریکییەی شەقامی ئوپلاندسگاتاندا بەگیرماوە، لەکاتێکدا من لەم دوورگەی سەوزەمێرگانەدا خەریکی غارغارێنم و ئەوەندەش

کامەرانم نەبێتەوە. ئەوەندە جوان بوو. گیا نەرم و شل و سەوز، گوڵەکان بە هەموو لایەکدا دەگەشانەوە، گردەکان نیان و سەوز، جۆگەلە ڕوونەکان لە گردەکانەوە بەرەوخوار شڵپە و شاخەیان دەهات، بەرغەلە کوڵکنە سپییەکان لەگیاکەدا دەلەوەڕان.

لەوێ کوڕەشوانێک دەڕۆیشت و بلوێری لێ دەدا. ئاوازێکی خەمناک، لەوە دەچوو پێشتر گوێم لێی بووبێ، لەکوێ، نازانم، دڵنیابووم کە لە ئوپلاندسگاتان نەبووە. ئێمەوە وەستاین و لەگەڵ کوڕەشوانەکەدا دەستمان کرد بە قسەکردن. ناوی نوونوو بوو. داوام کرد بۆ تۆزێ شمشاڵەکەیم بداتێ. دای پێم. ئەو فێری کردم، کە ئەو ئاوازە بژەنم.

نوونوو وتی: من دەتوانم سەر و بلوێرتان بۆ درووست بکەم، یانی ئەگەر حەز بکەن.

ئێمە وتمان حەزمان دەکرد ئێمەش سەر و شمشاڵی وامان هەبووایە. جۆگەلەیەک لەو نزیکانە خوڕەی دەهات. چنارێک چڵەکانی خۆی بەسەر ئاوەکەدا شۆڕکردبۆوە. نوونوو ڕایکرد و چڵێکی لە چنارەکە بڕی. ئێمەش لای جۆگەلەکە دانیشتبووین و قاچمان خستبووە ناو ئاوەکەوە و شڵپەشڵپمان دەکرد. نوونووش خەریک بوو شمشاڵی بۆ دەتاشین. یوم-یومیش فێربوو ئەو ئاوازە خەمناکە لێ بدا، نوونوو وتی: ئەمە ئەو ئاوازەیە، کە لەپێش هەموو ئاوازەکاندا لەدنیادا هەبووە. شوانەکان لە لەوەڕگاکاندا پێش هەزاران هەزارساڵ ئەم ئاوازەیان لێ داوە.

سوپاسی نوونووومان کرد بۆ ئەوەی شمشاڵەکانی بۆ دروست کردین و بۆ ئەوەش کە ئەو ئاوازە شیرینەی فێرکردین. دوایی سواری میرامیس بووینەوە و بەرەوپێش تاوماندایەوە. تا دوور دووریش کەوتینەوە، گوێمان لێ بوو نوونووو بەردەوام شمشاڵی لێ دەدا.

ئێمە پێویستە ئاگامان لە شمشاڵەکانمان بێت، من بە یوم-یوم وت، هەر کاتێکیش لە یەکتر دوورکەوتینەوە دەبێ ئەم ئاوازە لێ بدەین.

یوم-یوم توند توند باسکی لەناو قەدم ئالاندبوو، تا لە ئەسپەکە نەکەوێتە خوارەوە. لووتی ژەندبووە پشتمەوە و وتی:

- ئا، میۆ، پێویستە شمشاڵەکانمان بپارێزین. کاتێ تۆ گوێت لە دەنگی شمشاڵەکەم بوو، ئەوە بزانە کە من بانگت دەکەم.

ئا، ڕاستە، ئەگەر تۆش گوێت لێ بوو من هەمان ئاوازم لێ دا، ئەوە تۆش بزانە، کە من هاوارت لێ دەکەم.

یوم-یوم وتی و وا بەتوندی باوەشی پیاکردم، پێم وابوو بێجگە لە بابەشام ئەو چاکترین هاوڕێمە. دیارە، من بابەشامم لە هەموو کەسێکی تری سەر ڕووی زەمین خۆشتر دەوێت، بەڵام یوم-یوم کوڕێکی وەک خۆمە، دوای لە بێنکا دابڕان، ئەو باشترین هاوڕێمە.

بیر بکەوە، بابەشام هەیە، یوم-یوم و میرامیسیش و من بەسەر گردە سەوزەکان و لەناو مێرگەکاندا وەک با تاوی ئەسپەکەم دەدەم. هیچ مایەی سەرسووڕمان نییە ئەگەر دڵشادبم.

من پرسیم: چۆن پیاو دەچێ بۆ وڵاتی ئەوبەری ئاوەکە و ئەودیوی چیاکە،



ئێمە لە کەناری جۆگەلەکەدا دانیشتبووین و قاچمان خستبووە ئاوەکەوە و شڵپەشڵپمان دەکرد، لەکاتێکدا نوونوو خەریک بوو شمشاڵی بۆ دروست دەکردین.

،وم-یوم وتی: بەسەر پردی تیشکی بەیانیاندا.
- پردی تیشکی بەیانیان لەکوێیە؟
یوم-یوم وتی: تۆزێکی تر دەیبینین.
هەروەهاش بوو، دیمان. ئەوە پردێکی ئەوەندە بەرز و درێژ بوو پیاو کۆتاییەکەی نەدەدی. لەبەر تیشکی بەیانیدا دەبریسکایەوە و وا دەهاتە پێش چاو کە لە تیشکی ئاڵتوون درووست کرابێ.
یوم-یوم وتی: ئەوە درێژترین پردی دنیایە. ئەمە لە بەینی دوورگەی سەوزەمێرگان و وڵاتی ئەوبەری ئاوەکەدایە. پاشای خودانی ئێمە بەشەو هەڵیدەگرێ بۆ ئەوەی بتوانین لە دوورگەی سەوزەمێرگاندا بەئارامی بنووین.
من پرسیم: لەبەرچی؟ کێ دەتوانێ بەشەو بێت؟
یوم-یوم وتی: سوارەکاتۆ.
کاتێ وای وت وەکو ئەوەی بایەکی سارد هەڵکا، میرامیس دەستی کرد بە هەڵلەرزین.
ئەوە جاری یەکەم بوو ناوی سوارە-کاتۆ ببیستم. بە دەنگی بەرز بۆ خۆمم وت. سوارە-کاتۆ، کە وام وت سڕبووم.
یوم-یوم وتی: ئا ئەو دڵڕەقە دڕندەیە، سوارە-کاتۆ. میرامیس حیلەیەکی لێوە هات، زیاتر لە هاوار دەچوو. دوای ئەوە ئێمە چیتر باسی سوارە-کاتۆمان نەکرد.
زۆر حەز دەکەم کە بەسەر پردی تیشکی بەیانیاندا بپەڕمەوە، بەڵام لەپێشدا دەبێ پرس بە بابەشام بکەم و ڕێگەم بدا. لەبەر ئەوە بامانداﻳەوە و بەرەو باخی گوڵان گەڕاینەوە. ئەو ڕۆژە چیتر

ئەسپەکەمان نەئاژوا. میرامیسمان پاک کردەوە و یالیمان شانەکرد و دەستمان پێدا دەهێنا و ئەو کڵۆشەکر و وردەنانەمان دایە، کە دایکی یوم-یوم دابووی پێمان.
دواتر من و یوم-یوم کوختێکی بچکۆلەمان لە باخەکەدا دروستکرد و لەناویدا دانیشتین و نانمان خوارد. شلکێنەی ناسکمان بە شەکرەوە خوارد. ئەمە بەلەزەتترین شتە. دایکی بێنکاش جاروبار بۆی دەکردین، بەڵام شلکێنەکەی دایکی یوم-یوم زۆر خۆشتر بوو.
ئەوەندە خۆشە کوخت دروستکەی. هەر زۆر لەمێژ بوو، کە من بە ئاواتی دروستکردنیەوە بووم. بێنکا ئەوەندەی باسکردبوو کە چۆن لە هەواری هاوینەیان لە ڤاکسهۆلم دروستی دەکا. لەڕاستیشدا زۆر حەزم دەکرد دەربارەی کوختەکەی خۆم و یوم-یوم بۆ بێنکا بنووسم.
"خێراکە وەرە، بزانە چ کوختێکی جوانم دروست کردووە!" دەبێ بنووسم، "چ کوختێکی جوانم، لێرە، لەم وڵاتی دوورە بنیات ناوە."



# ئایا ئەستێرەکان گرنگی بەوە دەدەن، مرۆڤ ئاوازیان بۆ لێ بدا؟

بۆ ڕۆژی دوایی، ئێمە بەسواری چووینەوە بۆ لای نوونوو. لەپێشدا بۆمان نەدۆزرایەوە، بەڵام دوایی گوێمان لە دەنگی شمشاڵەکەی بوو کە لەپشت گردێکەوە دەهات. لەوێ بۆ خۆی شمشاڵی لێدەدا و مەڕەکانیشی لە دەوروپشتی دەلەوەڕان. کاتێ ئێمەی بینی، شمشاڵەکەی لە دەمی لابرد، تفێکی کەمی ڕۆکرد و دوایی دایە قاقای پێکەنین و وتی:

- هەمدیسان هاتنەوە!

پێوەی دیار بوو کە دڵخۆش بوو بەوەی گەڕاوینەتەوە بۆ لای. ئێمەش شمشاڵەکانمان دەرهێنا و بە سێقۆڵی دەستمان کرد بە ژەندن. ئەوەندە ئاوازی خۆش خۆش بوون، تێناگەم چۆن دەمانتوانی ئەو ئاوازە شیرینانە لێ بدەین.

من وتم: مایەی داخە، کەسێ لێرە نییە گوێمان لێ بگرێ، چۆن ئێمە دەیژەنین.

نوونوو وتی: گیا گوێی لێمانە، هەروەها گوڵ و با. درەخت گوێی لێیە، ئەو سپی چنارانەی خۆیان بەسەر جۆگەکەدا نووشتاندۆتەوە ئاگایان لێیە، ئێمە چۆن شمشاڵ دەژەنین.

من وتم: ئەوان گوێیان لێیە و حەزی لێ دەکەن.

نووننوو وتی: ئا، ئەوان زۆر پێیان خۆشە.
ماوەیەکی درێژ شمشاڵمان بۆ گیا و گوڵ و با و درەخت لێ دا.
بەڵام من پێم وابوو، بەهەرحاڵ، جێی داخە کە مرۆڤێ نییە گوێمان لێ بگرێ. دوایی نوونووو وتی:
ـ ئەگەر حەز دەکەیت، دەتوانین بچینە ماڵی ئێمە و شمشاڵ بۆ نەنکم بژەنین. من لای نەنکم دەژیم.
من پرسیم: ئەو شوێنەی لێی دەژیت زۆر لێرەوە دوورە؟
نوونووو وتی: ئا، بەڵام ئەگەر ئێمە لە کاتی ڕۆیشتندا شمشاڵ بژەنین، ڕێگاکە کورت دەبێتەوە.



ہوم-یومیش وتی: ڕاستە... ڕێگاکە قەت درێژ نابێتەوە، ئەگەر ئێمە بەڕێوە شمشاڵ لێ بدەین. ئەم حەزی دەکرد بچینە لای نەنکی نوونوو، منیش هەروەها.

لە ڕازە ئەفسانەییەکاندا هەمیشە نەنکی میهرەبان و دڵسۆز هەن. بەڵام من قەت بە ڕاستی و بە چاوی خۆم نەمدیبوون، هەرچەندە لەڕاستیشدا نەنکی وا زۆرن. بۆیە لام وابوو خۆش دەبێ ئەگەر بچین و سەرێ لە نەنکی نوونوو بدەین. هەموو مەڕ و بەرخەکانی نوونووش دەبێ لەگەڵ خۆمان بەرین. میرامیسیش. لەپێشدا ہوم-یوم و نوونوو و من، دوایی مەڕ و بەرخەکان و میرامیسیش،



هێواش هێواش عەینەن کالەپونت درەنگئاخێز، هەموو پێکەوە بەسەر گردەکاندا بە شمشاڵلێدان دەڕۆیشتین. بەرخەکان لەوە سەریان سووڕمابوو ئێمە بۆ کوێ ملی ڕێگامان گرتووە، بەڵام فرە پێشیان خۆش بوو، بۆیەش بە چواردەورماندا دەیانباعاند و هەڵدەقونین.

ماوەی چەند سەعاتێکی خایاند چەندین گردمان بڕیبوو، دوایی گەیشتینە ماڵی نوونوو. ئەمیش هەر لە ماڵی ڕازە ئەفسانەییەکان



ده‌چوو، ماڵێکی سه‌رقووچی قشتیله‌ی عه‌نتیکه بوو، به‌رده‌مه‌که‌ی هه‌مووی گوڵی یاس و یاسه‌مه‌ن بوو.

نوونوو وتی: بێ ده‌نگ بن، ئێستا له‌پڕدا خۆمان نیشانی نه‌نکم ده‌ده‌ین.

په‌نجه‌ره‌یه‌ک کرابۆوه‌، دیاره که‌سێ له‌ژووره‌وه خه‌ریک بوو. ئێمه له‌به‌ر په‌نجه‌ره‌که‌دا ڕیزمان گرت، نوونوو، یوم-یوم و من.

- یه‌ک، دوو، هه‌رسێکی و ده‌ستمان پێکرد.

ئا، ئێمه وامان کرد. ده‌ستمان کرد به شمشاڵلێدان و ئاوازێکی وا به جۆش و پێکه‌نین و هاوه‌رمان لێ ده‌دا، که به‌رخه‌کان گوێیان لێی ده‌بوو، ده‌بووایه هه‌ر هه‌ڵبه‌زنه‌وه و سه‌ما بکه‌ن. پیره‌ژنێک هاته به‌ر په‌نجه‌ره‌که‌، ئه‌وه‌نده ڕۆحسووک و میهره‌بان دیاربوو. ئه‌وه نه‌نکی نوونوو بوو. هه‌ردوو ده‌ستی دا به‌یه‌کدا و وتی:

- ئای، چ ئاوازێکی خۆشه‌!

ماوه‌یه‌کی درێژ شمشاڵمان بۆ لێدا، ئه‌ویش هه‌ر له‌به‌ر په‌نجه‌ره‌که‌دا وه‌ستابوو، گوێی شل کردبوو بۆمان. ئه‌وه‌نده پیر بوو، هه‌رچه‌نده نه‌نکێکی ڕاسته‌قینه و زیندووش بوو، به‌ڵام شێوازێکی ئه‌فسانه‌یی هه‌بوو.

دوایی چووینه ماڵه‌که‌. نه‌نکی نوونوو لێی پرسین، که ئاخۆ برسیمان نییه‌. ڕاستییه‌که‌شی برسیمان بوو. ئه‌وساکه‌، له‌واشه‌یه‌کی ئه‌ستووری هێنا و به‌شی داین. نانێکی بۆری ڕه‌ق بوو، ئه‌وه خۆشترین نان بوو، که من له هه‌موو ژیانمدا خواردبێتم.

ـ ئای، چ تامێکی خۆشی هەیە، من بە نووننووم وت. ئەمە چ جۆرە نانێکە؟

نوونوو وتی: نازانم، ئەمە چ جۆرێکی نانە، ئێمە پێی دەڵێین نانی سکی برسی تێرکەر.

میرامیس دەیویست ئەویش لەگەڵ بێ و بخوا. هات و لە پەنجەرە کراوەکەوە سەری هێنایە ژوورێ و تۆزێ پرماندی. ئێمە پێی پێکەنین چونکە زۆر قەشمەرانە بوو، بەڵام نەنکی نوونوو لووتی ئەسپەکەی خوراند و ئەویش کوتێ لەو نانە چاکەی بەرکەوت.

دوایی من تینووم بوو. کە بە نوونووم وت، وتی:

ـ دوام کەوە!

بردینیە باخەکە، لەوێ کانییەکی ڕوونی لێ بوو. نوونوو کاسەیەکی کرد بە کانییەکەدا و پڕی کرد لە ئاو، هەر بە کاسەکە خواردمانەوە، ئاوی وا سارد و سازگارم قەت پێشتر بە عومرم نەخواردبۆوە.

بە نوونووم وت: چ ئاوێکی سازگارە، ئەمە چ جۆرە کانییەکە؟

ـ نازانم، ئەگەر جۆرێک کانیی تایبەتی بێ، بەڵام ئێمە پێی دەڵێین، کانیی تینووێتیشکێن.

میرامیسیش تینووی بوو، ئاومان دا بە ئەو و بە بەرخ و مەڕەکانیش.

دەبووایە نوونوو زوو بە خۆی و مەڕ و بەرخەکانەوە بگەڕانایەتەوە لەوەڕگای نێوان گردەکان. داوای لە نەنکی کرد کە فەرەنجییەکەی

بۆ بێنێ. کە شەوان لە دەشت لەگەڵ ڕانەکەیدا دەمایەوە، ئەو فەرەنجییەی لەخۆیەوە دەپێچا. نەنکی فەرەنجییەکی قاوەیی دەرهێنا و دای پێی. من پێم وابوو، کە نوونوو زۆر بەختەوەرە بەوەی شەوان لە دەشت دەنوێ. من هەرگیز جارێک ئەمەم تاقی نەکردبۆوە. بێنکا و باوک و دایکی جاروبار بە پاسکیل دەچوونە دەشت و لە گردۆڵکەی خۆشی ناو دارستانێکدا چادریان هەڵدەدا. کیسەخەویان پێ بوو شەو تیایدا دەنووستن. بێنکا هەمیشە دەیگوت، کە ئەمە خۆشترین شتە و بێگومان منیش هەر لام وابوو.

بە نوونووم وت: ئەگەر یەکێک هەر هیچ نەبێ شەوێکی تەواوی لە دەشت بەسەر ببردایە!

نوونوو وتی: تۆ دەتوانی وا بکەیت، وەرە لەگەڵم.

ـ نا! ئەگەر شەو نەڕۆمەوە بابەشام دەکەوێتە دڵەڕاوکە.

نەنکی نوونوو وتی: من دەتوانم بچمە کن خودانی ئێمە و پێی ڕاگەیەنم کە تۆ ئیمشەو لە دەشت دەنوی.

یوم-یوم وتی: بۆ لای باوکی منیش.

نەنکی نوونوو وتی: هەروەها بۆ لای باخەوانەکەش.

یوم-یوم و من زۆر دڵمان خۆش بوو، بە جۆرێک کە لە بەرخەکان خراپتر هەڵبەز و دابەزمان دەکرد.

بەڵام نەنکی نوونوو کە سەیری بلووزە سپییە کورتەکەی من و ئەوەی یوم-یومی کرد، هەر ئەوەشمان لەبەردا بوو، وتی:

ـ دوای ڕۆژئاوابوون لە سەرماندا دەتەزن.



میرامیسیش سەری لە پەنجەرە کراوەکەوە هێنایە ژوورێ.

ا.وايیش لەناکاو، بە خەمباری بە دەنگێکی نزم وتی:

دوو فەرەنجیی تریشم هەن.

چووە لای کۆنەسندوقێک، کە لە سووچێکی ماڵەکەدا دانرابوو، دوو فەرەنجیی دەرهێنا، سوورێک و شینێک.

ـوونوو بە ڕوویەکی خەمناکەوە وتی:

- فەرەنجیی براکانمن.

لیم پرسی: براکانت لەکوێن؟





ـ سـواره-كـاتۆ، ئاخـێكی هەڵكێشـا ، ئەو سـواره-كـاتۆ دڕندەیە فڕاندنی.
كە وای وت میرامیسـیش لەو بەردەمەدا وەستابوو، بە شێوەیەكی وا حیلاندی، دەتوت بە قامچی لێی دەدەن.
هەر بەرخــە و بەترســەوە بەرەو لای دایكی ڕایكرد و هەر مــەڕە و دەیباعاند و وەك ئەوەی دواهەناسەیان بێت.
ئیتر نەنكی نووننوو فەرەنجییە سوورەكەی دا بە من و شینەكەی دا بە یوم-یوم. هەروەها نانێكی لەوەی سكی برسـیـیـان تێـر دەكـا و كـاسـەیەك ئاوی كـانیی تـینووێتـیـشكێنی دا بە نـووننوو. پێكەوە هەمان ڕێگامان گرتەبەر و بەسەر گردەكاندا كە پیایاندا هاتبووین، گەڕاینەوە.
من خـەمباربووم بـۆ براكانی نوونـنوو، بەڵام نەشـمدەتوانی شـادمـان نەبم بەوەی كە لەو دەشتە لەسەر زەوی دەنووم.
كـاتێ گـەیشـتـینە لای ئەو گردەی كـە چنارەكەی بەسـەر جۆگـەكەدا شـۆڕبۆتەوە، وەسـتـاین، نووننوو وتی ئێـمـە ئەمـشـەو لێـرە بارگـە دەخەین.
هەر واشـمـان كرد. ئاگرێكی گەورە و گەرمی عەجایەبمان كردەوە. بەدەوریدا دانـیـشـتـین و نانی برسـیـێـتـیـڕەوێنمـان خـوارد و ئاوی تینووێتـیـشـكـێنمـان خـواردەوە. ڕۆژ ئاوابوو، تاریك داهات، بەڵام ئەمـە هیچ نـەبوو، چونكە ئـاگـرەكە ئەو دەورەی وا ڕۆشن كـردبۆوە. فـەرەنجـیـیـەكـانمان بە خـۆمـانەوە لوولدابوو و ترنجابووینە یەك و

راکشابووین، به دەوری ئێمەشدا مەڕ و بەرخەکان پەپکەیان دابوو و نووستبوون، میرامیسیش لەو نزیکە دەلەوەڕا. ئێمە لەوێ راکشابووین و گوێمان لە با بوو گیای دەلەراندەوە، چاومان لەو ئاگرانەش بوو لە دوور کرابوونەوە. ئاگری زۆر لەوشەوەدا دەگرا، چونکە دوورگەی سەوزەمێرگان شوانانێکی زۆری لێیە. گوێمان لەو ئاوازە کۆنە دەبوو، کە لەتاریکیدا شوانەکان لێیان دەدا. ئەوەی نوونوو وتی، لە هەزاران هەزار ساڵ پێش ئێستەوە ژەنراوە. لەوێ راکشابووین و چاومان لەو ئاگرە و گوێمان لەو ئاوازە کۆنە بوو، کە شوانێکی نەناس لەو تاریکییەدا بۆ ئێمەی دەژەند. لەوە دەچوو، ئەو ئاوازە، پەیوەندییەکی تایبەتی بە منەوە هەبێ.

لە ئاسماندا ئەستێرەکان گەش گەش جریوەیان دەهات، ئەستێرەی ئەوەندە گەورە و درەوشاوە بوون، کە من ئاوا نەمدیبوون. راکشابووم و تێم دەنواڕین، خۆم خستبووە سەر پشت و لە فەرەنجییەکەمدا درێژبووبووم و ئەوەندە خۆشم بوو کە سەیرم دەکردن. دوایی کەوتمە بیری ئەوەی، کە ئێمە شمشاڵمان بۆ گیا و گوڵ و با و درەخت لێ دا، نوونووش وتی ئەوان پێیان خۆشە و هەزی لێ دەکەن. بەڵام ئەی خۆ ئێمە بۆ ئەستێرەکانمان نەدەژەند. ئایا ئەستێرەکان مەبەستیانە و دەربەست دێن ئەگەر مرۆڤ شمشاڵیان بۆ لێ بدا، من لە هۆڵی زانینی ئەمەدا بووم! لە نوونووم پرسی، وتی ئەو پێی وایە کە ئەستێرەکانیش حەزیان لەو ئاوازانەیە و دوای ئەمە هەستاین و شمشاڵەکانمان دەرهێنا و تۆزێکیشمان بۆ ئەستێرەکان ژەند.

# ئەو بیرەی شەوان دەچپێنێ

وڵاتی ئەوبەری ئاوەکە و ئەودیوی چیاکەم نەدیبوو، بەڵام ڕۆژێکیان لەگەڵ بابەشامدا لەباخەکەدا پیاسەمان دەکرد، لێم پرسی، کە ئاخۆ دەتوانم بەسەر پردی تیشکی بەیانیاندا بپەڕمەوە. بابەشام ڕاوەستا و ڕووخساری خستمە نێوان هەردوو دەستی. وەها دۆستانە و بەسامەوە سەیری کردم:

ـ میۆ، میۆکەم. تۆ دەتوانی لە دوورگەی سەوزەمێرگاندا بۆ خۆت یاری بکەی، یان بەسواری برۆی بۆ وڵاتی ئەوبەری ئاو و پشتی چیاکە، ئەگەر حەزبکەی. دەتوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، باکوور و باشوور تەی بکەیت و بگەڕێی تا چەنێ میرامیس توانای هەڵگرتنتی هەبێ. بەڵام پێویستە شتێک بزانی، وڵاتێکی تر لەنزیکمان هەیە...

ـ کێ لەوێ دەژی؟

بابەشام وتی: سوارە-کاتۆ، بەڵام وەک ئەوە وابوو سیمای ڕەش داگەڕێ، ئەو سوارەکاتۆ دڕندەیە.

کاتێ ناوی هێنا، لەوە دەچوو کە شتێکی مایەی بەڵا و ترسناک بێت و بە باخەکەدا ڕەت ببێ. باڵندە سپییەکان فڕینەوە هێلانەکانیان. باڵندەی خەم بە بەرزی زریکاندی و باڵە ڕەشە ئەستوورەکانی دا بە یەکدا. لەوساتەدا هەندێ گوڵەباخ وەرین.

ـ میۆ، میۆکەی خۆم. تۆ شیرینترین کەسمی، بەڵام کە بیر لە سوارەکاتۆ دەکەمەوە، دڵم وا دەگوشرێ.

سپی چنارەکان دەتگوت زریانێک هەژاندوونی و خستوونیەتە هاژە و هەرا. گەڵای زۆر وەرینە سەر خاک، لەوەش دەچوو لە کاتی وەرینیاندا کەسێ بگری. هەستم کرد کە زۆر لە سوارەکاتۆ دەترسم، ئەوەندە دەترسم نەبێتەوە.

پێم وت: ئەگەر دڵت دەگوشرێ، چیدی بیری لێ مەکەوە.

بابەشام سەرێکی بادا و دەستی گرتم.

ـ ڕاست دەکەی. با تۆزێ واز لەوە بهێنم و بیر لە کاتۆ نەکەمەوە. تۆزێ شمشاڵم بۆ لێ بدە و خانۆچکە و ماقڵە بکە لەباخەکەدا.

دوایی ڕۆیشتین و ویستمان تەگبیری یوم-یوم بکەین.

بابەشام ئەوەندەی کاروبار و سەرقاڵی هەیە لە مەملەکەتە گەورەکەیدا، هەر مەپرسە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا وەختیشی هەیە بۆ منی تەرخان بکات. ئەو قەت نەیوت: "وەلبە و برۆ، وەختم نییە!" زۆر حەزی دەکرد لەتەکما بێ. هەموو بەیانییەک لەباخەکەدا پیاسەی لەگەڵ دەکردم، هێلانەی باڵندەکانی نیشان دەدام، سەیری خانۆچکەکانی دەکرد و فێری دەکردم چۆن میرامیس باژۆم. لەگەڵ من و یوم-یومدا باسی هەموو شتێکی دەکرد. عەینەن چۆن باوکی بێنکا دەمەتەقێی لەگەڵ من دەکرد. زۆر خۆش بوو کە باوکی بێنکا قسەی لەگەڵ دەکردم، بێنکا ئەوەندە ڕووی دەکرایەوە و پێی خۆش بوو، هەروەک ئەوەی بڵێ: "بەهەرحاڵ، ئەم باوکی منە، بەڵام پێم

خـۆشـه تۆش دەدوێنێ." منیش، کـه بابەشـام یوم-یومـی دەدواند، هەروام هەست دەکرد.

زۆر باشـیش بوو کـه بەسـواری من و یوم-یوم له دەرەوه بـووین و دەسـووڕاینەوه، ئەگینا بابەشام لەکوێ کاروباری وڵاته گەورەکەیی پێ هەڵدەسووڕێنرا. ئەگەر ئێمه هەموو ئەو ڕۆژه درێژانه لەدەرەوه نەبووینایه، دەبووایه بابەشـام لەباتی ئەوەی کـاروبار و ئەرکـی سـەرشانی جێبەجێ بکات، هەر خـەریکی یاری و قسەکردن بێ لەگـەڵ مندا. کـەواته، زۆرباش بوو، کـه من هەم یوم-یوم و هەم میرامیسیشم هەبوو. ئای، میرامیسەکەم، چەندێ غار و ڕمبازێنم پێ کردووی!

چۆن میرامیسەکەم بەسەر پردی تیشکی بەیانیاندا پەڕاندمییەوه، هەرگیز له بیرم ناچێ.

تاریکوڕوونی بەیانـی بوو، کـاتێ پاسەوانانـی پردەکـه، پردەکـەیان دانابۆوه. گـیـای نەرم به ئاونگ تەڕ تەڕ بووبوو، هەر چوارپەلـی مـیـرامـیـسـیش تەڕبوو، بەڵام هەر باکـیـشی نەبوو. من و یوم-یوم هێشـتـا چاومـان به خـەوەوه بوو، چونکه زۆر زوو هەسـتـابووین. هەواکەی سارد و پاک بوو، له ڕووخساریش ئەوەنده خۆش دەهات. کـاتێکیش مـێـرگـەکـانمان به غـار دەبڕی، بەتەواوی خـەو بەری دابووین. هەر خۆر کەوت، گەیشتینه سەر پردەکه. کاتێ بەسواری پردەکـەمـان دەبڕی، وەکـو ئەوه وابوو، کـه بەناو تیـشکی زێڕین و ڕووناکییدا تاو بدەین. بەرز بەرز پردەکه بەسەر ئاوەکەدا دەیڕوانـی.

مــرۆڤ ئەگــەر ســەیری خــوارەوەی بکردایە، بەتەواوی تووشی سـەرەسـووڕە دەبوو. ئەوە بەرزترین و درێژترین پردی دنیـا بوو، ئێمەش بەسواری لێی دەپەڕینەوە. یاڵی میرامیس لەبەر هەتاوەکەدا دەبریسکایەوە. بەرەو پێشتر و پێشتر تاوی دەدا، بەرزتر و بەرزتر پردەکەمان دەبڕی. سمکۆڵی میرامیس دەتگوت هەورەگرمەیە. هەر زۆر چاک بوو. ئەوەندەی تۆزێکی مـابوو ولاتی ئەوبەری ئاوەکـە ببینم، تەواو لێی نزیک بووبووینەوە.
هاوارم کرد:
ـ یوم–یوم، یوم–یوم. دڵت خۆش نییە! ئا ئەمە ئەوبەڕی هونەر نییە. هەستم کرد لەوەیە شتێکی ناهەموار ڕووبدات، چوارپەلی میرامیس کەوتبـووە بۆشـایی و بەحـەواوە سـمکۆڵی دەکـرد. پاسـەوانەکـان پردەکەیان بەتەواوی قایم نەکردبوو. جەمسەرێکی پردەکە بەحەواوە بوو، بۆشـاییەکی قـووڵی لەعنەتی کەوتبـووە بەینی کـەنار و سـەری پردەکە. قـەت پێشـتر وەها نـەترسـابووم. ویسـتم هاوار لە یوم–یوم بکەم، دەنگم دەرنەدەهات. ویسـتم جڵـەوی میـرامـیس بگرمـەوە و لغاوەکەی توند بکەم تا بوەستێ، بەڵام گوێی نەدامێ. بە شێوەیەکی کێوی دەیحیلاند و بەرەو مردن قەڵەمباز و تاوی دەدا، چوارناڵەی دەکرد. بۆ دەترسام؟ تۆزێکی تر دەگلاینە ناو ئەو هەڵدێرە، تۆزێکی تر ئیتر لەباتی تەقەی سمی میرامیس گوێم لە ناڵە و زریکەی دەبێ، کـاتێ یاڵی دەشـێـوێ و بۆ قـووڵایی گلۆردەبێتـەوە. چاوەکـانم، بەئاستەم، لێک نا و بیرم لە بابەشـام کردەوە. سمکۆڵی میرامیس

دەتگوت هـەورەتریشـقـەیە. لەپڕدا دەنگی سـمکۆڵی نەمـا. گـوێم لێ دەبوو، بەڵام ئەمـەیان جیاواز بوو. وەکو خشـەخش دەهاتە بەر بای گوێ، وەکو پەلی مـیرامیس لە شتێکی نەرم بخشێ. چاوم کردەوە بینیم پەلی میرامیس بەحەواوەیە.

ئای لە مـیرامـیسی باڵزێڕین، خۆ ئەوە هەروەک لەسـەر ئەرز، ئاواش لە ئاسمـاندا دەفڕێ! میرامیس، ئەگەر بیویستایە، دەیتوانی بەسەر هەوردا تاو بدا و بەسەر ئەستێرەدا بازبدا. کەسێکی دی بێجگە لە من ئەسپێکی وای نییە. کەس ناتوانێ لەوە بگات چ هەستێک مرۆڤ دادەگرێ کە بە کـۆڵی ئەسـپێکی واوە بیت و بەرەو وڵاتی ئەوبەری ئاوەکە تاوبدەی، کە لەخوارەوە لەژێر تیشکی هەتاودایە.

قیراندم:

ـ یوم-یوم، یوم-یوم... میرامیس بەسەر هەوردا تاو دەدا.

یوم-یوم وتـی: بۆ نەتدەزانـی! وەکـو ئەوەی شـتـێکی ئەوەنـدە سـەیر نەبێ.

من وتم: نەء، چۆن و لەکوێوە ئەمە بزانم.

ئەوساکە یوم-یوم دایە قاقای پێکەنین.

ـ میۆ، ئەوەندە کەم دەزانی!

مـاوەیەکی درێژ بەحـەواوە دەمـانئـاژوا. مـیـرامـیس بەسـەر هـەورە سـپـیـیـەکـاندا قـەڵەمـبـازی دەدا، ئەوەندە خـۆش بوو. لەدواییدا ویستمـان بنیشـینەوە سەر زەوی. میرامیس بەهێواشی خۆی بەرەو زەوی شۆڕکردەوە و ڕاوەستا، ئەوە خاکی ئەوبەری ئاوەکە بوو.



یوم-یوم وتی: لێره لەوەڕگایەکی سەوزی لێیه بۆ میرامیسی باڵزێڕین. با لەوێ بلەوەڕێ، تا ئێمه دەچین و سەرێک له یری دەدەین.

- یری کێیه؟

یوم-یوم وتی: دوایی دەیبینین. یری و برا و خوشکانی ئا لەم نزیکانه دەژین.

ئەوسا دەستی گرتم و بردمییە خانوویەک لەو نزیکە. خانوویەکی بچکۆلەی سپیی کلاوقووچ، ئەمیش عەینەن وەکو ئەوانەی ڕازە ئەفسانییەکان وابوو. زۆر گرانە، ڕوون بکرێتەوە، چییە و چۆنە، خانوو لە هی ڕازی ئەفسانەیی بچێ و یان شتێک بەحەواوە بێت و یان ئەوەی پەیوەندیی بە درەختێکی کۆنەوە هەبێ، کە چواردەوری ئەو ناوەی گرتووە، یان گوڵی باخەکە بۆنێکی سیحراوی هەبێ، ڕەنگە ئەمە بە شتێکی ترەوە بەند بێ. لە باخەکەی بەردەم ماڵی یریدا بیرێکی خڕی کۆنی لێیە. تەقریبەن باوەڕم وایە، کە بەهۆی بیرەکەوە بوو، ماڵەکەی یری لە ماڵی ڕازە ئەفسانییەکان دەچوو. ئەم جۆرە بیرانە ئێستە نین، بە لای کەمەوە، من پێشتر بیری وام نەدیبوو.

پێنج منداڵ لە دەوری بیرەکە دانیشتبوون. گەورەکەیان کوڕێکی ڕووخۆش و یەکجار ئێسکسووک بوو.

کوڕەکە وتی:

ـ من ئێوەم دی هاتن.

ـ من یوم-یومم و ئەمیش میۆیە.

کوڕەکە وتی:

ـ دەزانم. منیش ناوم یریە، ئەمانەش برا و خوشکەکانمن.

زۆر ژیکەلە و دۆستانە دیاربوو، برا و خوشکەکانیشی هەروا بوون، لەوە دەچوو هاتنەکەی ئێمەیان پێ خۆش بووبێ.

هەرگیز لە ئوپلاندسگاتان وانەبوو. لەوێ ئەو کوڕە چوختی و

جنێوفرۆشانه هەر کە دەگەیشتیتە بەرەوە و نزیکیان دەبوویتەوە، ئەگەر هاورێی نزیکیان نەبوویتایە، گورگئاسا تێت دەورووکان. هەمیشە یەکێکیان دەدۆزییەوە ڕقی لێ هەڵبگرن و لەیاریدا لەسەری نەکەن. ئەو کەسەش دایمە من بووم. تەنیا بێنکا بوو، هەمیشە، دەیویست یاریم لەگەڵدا بکات. کوڕێکی گەورەی لێ بوو، ناوی یاننی بوو، من قەت هیچم لێ نەکردبوو، بەڵام هەر کە دەیدیم خێرا دەیوت: "ونبە لەبەر چاوم، پێش ئەوەی تێهەڵدانێکی وا بخۆی، لە هۆش خۆت بچی و ببووریتەوە!" دوایی ئەوەشی نەدەهێنا کە من هەوڵ بدەم یاریی چاوشارکێ و شتی تریان لەگەڵدا بکەم. منداڵەکانی تریش گوێ لە مستی یانی بوون و قسەکانی ئەویان دووبارە دەکردەوە، هەموو هەر عەینەن بەزم بوون، چونکە یاننی کەتەیەکی زل بوو.

پیاو بیر دەکاتەوە، ئەگەر توانیبێتی لەگەڵ یاننیدا هەڵبکا. ئیتر کە کەسانی وەک یوم-یوم و یری و برا و خوشکەکانی دەبینێ سەری سووڕدەمێنێ. چونکە هەموو کاتێ هەر دۆستانە و چاک بوون. من و یوم-یوم لە تەنیشت یرییەوە لەسەر لێواری بیرەکە دانیشتین. سەیرێکی خوارەوەی بیرەکەم کرد، ئەوەندە قووڵ بوو بنەکەی نەدەبینرا.

- چۆن ئاو لەم بیرە هەڵدەگۆزن؟

یری وتی: ئاوی لێ هەڵناگۆزین، ئەمە بیری ئاوخواردنەوە نییە.

وتم: ئەی بیری چییە.



ـ ئەم بیرە ناوی ئەو بیرەیە کە بە شەوان دەچپێنێ.

وتم: بۆ ناوی ئەوەیە.

یری وتی: چاوەڕێ بکە تا شەو دێ، ئەوسا تێ دەگەی.

هەموو ڕۆژەکەمان لای یری و برا و خوشکەکانی بەسەربرد. لەژێر درەختە پیرەکەدا خەریکی یاریکردن بووین. کاتێ برسیمان بوو مینوننا-نێللی خوشکی یری ڕایکرد و چوو لە موبەقەکە نانی بۆ هێناین. ئەمەش هەر لەو نانە بوو کە برسییەتی دەڕەواندەوە و، هەروەک پێشوو حەزم لێ دەکرد.

کەوچکێکم لەژێر درەختەکەدا دۆزییەوە، کەوچکێکی بچکۆلەی

،،وین بوو. پیشانی یریم دا، هەر کە بینی ڕووی خەمبار هەڵگەڕا.
،،ی وتی: کەوچکی خوشکەکەمانە. هاواری لە برا و خوشکەکانی
،رد، میۆ، کەوچکی خوشکەکەمانی دۆزییەوە.
،رسیم: خوشکەکەتان لەکوێیە؟
،،ی وتی: سوارەکاتۆ، ئەو دڕندەیە، سوارەکاتۆ، فڕاندی.
،اتێ ناوی کاتۆی هێنا هەوای دەوروبەرمان بوو بە سەهۆڵبەندان،
،وڵەبەڕۆژەیەکی گەورە لەباخچەکەدا بوو، وشک بوو. پەپوولەیەکی
،،ر باڵیان هەڵوەری و چیتر توانای فڕینیان نەما. منیش ترسێکی
،بنامانی سوارەکاتۆ کەوتبووە دڵم، ئەوەندە دەترسام، ئەوەندە
،،ەترسام هەر مەپرسە.



ویستم کەوچکە زیوینەکە بدەمەوە بە یری، بەڵام ئەو وتی:
ـ با بۆ خۆت بێ، چونکە ئەو ئیتر قەت پێویستی پێی نابێ، تۆش دۆزیوتەتەوە.
برا و خوشکە بچکۆلەکانی، کاتێ بیستیان خوشکەکەیان قەت پێویستی بە کەوچک نابێ، دایانە پرمەی گریان. ئیتر دەستمان کردەوە بە یاریکردن و چیتر بیرمان لە شتی ناخۆش نەکردەوە. کەوچکەکەم خستە گیرفانمەوە و بیرم لێ نەکردەوە. بەڵام لە کاتی یاریکردنەکەشدا، هەر خواخوای هاتنی ئێوارەم بوو، بۆ ئەوەی زیاتر دەربارەی ئەو بیرە تایبەتە بزانم.
ڕۆژ ئاوابووبوو، تاریک داهات، ئەوسا یری و خوشک و براکانی بە شێوەیەکی سەیر تەماشای یەکتریان دەکرد.
یریش وتی: ئێستە!
ئەوساکە چووینە سەر لێواری بیرەکە و پێکەوە دانیشتین.
یری وتی: هەموو بێدەنگ بن.
ئێمە هەر بێدەنگ بووین و چاوەڕێمان دەکرد. نێوانی درەختە پیرەکان تاریکتر دادەهات، ماڵەکەی یریش زیاتر لە ماڵی ڕازە ئەفسانییەکان دەچوو. لەوێ قووت بووبووە و بۆری دەکردەوە، ڕەشێکی سەیر بوو، تۆخ نەبوو، چونکە هێشتا تەواو تاریکی نەکردبوو. شتێکی بۆری غەریب و کۆن بەسەر ماڵ و درەخت و ئەو بیرەوە بوو، کە ئێمە بەدەوریدا ئەڵقەمان دابوو.
یری چپاندی: هەموو تەواو بێدەنگ بن، لەگەڵ ئەوەشدا کە



لەوێ، بە دەوری قەراغی بیرەکەدا دانیشتبوون، شتێکی سەیر و کۆن و خۆڵەمێشی باڵی بەسەر بیرەکەدا کێشابوو.

ماوەیەکی درێژ بوو کڕ و کش و مات بووین، نێو درەختەکان تا دەهات زیاتر تاریک و بۆر هەڵدەگەڕا، هەموو شتێ کش و خامۆش بوو، هیچم نەدەبیست.

بەڵام گوێم لە شتێک بوو، گوێم لێ بوو. گوێم لێ بوو کە لە بنی بیرەکەوە چپەچپ دەهات. لە بنی بنەوە ورتە دەهات. دەنگێکی ئەوەندە نامۆ و سەیر بوو لە هیچ دەنگێ نەدەچوو. دەنگەکەش ڕازی دەگێڕایەوە. جۆرە ڕازێک بوون کە هیچ لە ڕازەکانی تر نەدەچوون و لە هەموو ڕازەکانی دنیاش خۆشتر و شیرینتر بوون. شتێکی تر نییە، کە من بەقەد ڕاز حەزی لێ بکەم. بۆیە تەخت لەسەر سک خۆم دابوو بەسەر لێواری بیرەکەدا، بۆ ئەوەی زیاتر و زیاتر گوێم لەو دەنگە بێ، کە دەیچپاند. جاروبار گۆرانیشی دەوت، ئەوانە خۆشترین و نامۆترین گۆرانی بوون.

بە پریم وت: ئەم بیرە سەیرە چییە.

پری وتی: بیرێکی پڕ لە ڕاز و گۆرانییە، من هەر ئەوەندەی لێ دەزانم. بیرێکی پڕ لە ڕاز و گۆرانیی لەبیرکراوە، ئەوانەی کە زۆر لەمەوبەر لە دنیادا هەبوون و لەمێژیشە مرۆڤ لەبیری چوونەتەوە. تەنیا ئەم بیرەیە هەمووی لەبیرماون و بەشەوان دەیانڵێتەوە.

نازانم چ قەدەرێ لەوێ ماینەوە، نێوان دار و درەختەکان تاریکتر دادەهات، دەنگی ناو بیرەکەش خامۆش و خامۆشتر دەبوو، لە کۆتاییدا دەنگەکە بڕا و چیدی گوێمان لە هیچ نەبوو.

لەو لەوەڕگا سەوزەدا میرامیس حیلەی دەهات. وەکو ئەوەی بیر

منی بخاتەوە، کە پێویستە خێرا بکەم و بەپەلە بڕۆمەوە بۆ لای بابەشام.

بە دوعا، یری، خوات لەگەڵ مینوننا-نیلل، خواتان لەگەڵ هەمووتان.

یری وتی: خوات لەگەڵ میق، خوات لەگەڵ یوم-یوم. زوو سەربدەنەوە.

من وتم: بەڵێ، بەزوویی دەگەڕێینەوە.

میرامیسمان هێنا و خۆمان هاویشتە سەر پشتی و بەرەو ماڵ بە مار و چوارناڵە تێمان تەقاند. ئەو تاریکییە نەما، چونکە مانگ لەئاسماندا بەرزبووبووە و بەسەر ئەو مێرگە سەوز و درەختە کش و ماتانەدا دەدرەوشایەوە، وەکو ئەوەی هەموو لە زیو بن، وەکو سپی چنارەکانی ماڵەوە لە باخەکەی بابەشامدا سپی سپی دەیاننواند.

هاتین بەرەو پردی تیشکی بەیانیان، بەڵام لەوە بوو نەیناسمەوە. بەتەواوی گۆڕابوو. لەوە دەچوو لە تیشکی زیوینی مانگ دروستکرابێ.

یوم-یوم وتی: بەشەو ناوێکی تری هەیە.

وتم: ناوی چییە بە شەو.

یوم-یوم وتی: پردی مانگەشەو.

بەخێرایی بەسەر پردی مانگەشەودا تێپەڕین، چونکە پاسەوانەکان بەتەمابوون دوای تۆزێکی تر لایبەرن. ئاگری شوانەکانمان لە دوورگەی سەوزەمێرگاندا دەدەی، لەدوورەوە لە بڵێسەیەکی بچووک دەچوون.

هەموو دنیا کشومات بوو، لە تەقەی سمی میرامیس زیاتر، کە لەسەر پردەکە سمکۆڵی دەکرد، هیچی تر نەدەبیسترا. میرامیس لەبەر تریفەی مانگدا لە ئەسپێکی سیحراوی دەچوو، یاڵی لەباتی زێڕین، ئەمجارە زیوین بوو. خەیاڵم هەر لای ئەو بیرە بوو کە بە شەوان دەچپێنێ. بیرم لای ئەو ڕازانە بوو کە بیستبوومن، شتێکی تایبەتیان تیابوو، کە زۆر بە دڵمدا چووبوو، ئا ئەوا دەستی پێدەکرد:

هەبوو نەبوو، جارانی زوو، کوڕەپاشایەک هەبوو، لەبەر تریفەی مانگەشەودا لەدەرەوە بوو، بەسواری ڕێگای دەبڕی.

بڵێ، زەینی بدەرێ، کە ئەوە تەقریبەن من بم! چونکە منیش کوڕەپاشام.

لە دوورگەی سەوزەمێرگان نزیکتر و نزیکتر دەبووینەوە. سمکۆڵی میرامیس وەک تریشقە دەینالاند، هەموو وەختە کە بیرم هەر لای ئەو ڕازە بوو کە زۆر شیرین بوو.

هەبوو نەبوو، جارانی زوو، کوڕە پاشایەک هەبوو، لەبەر تریفەی مانگەشەودا لەدەرەوە بوو، بەسواری ڕێگای دەبڕی.

# ئەو بە سواری ڕۆی بەناو دارستانە تاریکەکەدا

ئەو وەختەی لای مام سیکستن و پوورە ئیدلا دەژیام، کتێبی ڕاز و حیکایەتە ئەفسانەییەکانم لە کتێبخانە وەردەگرت. بەڵام پوورە ئیدلا ئەمەی زۆر پێ خۆش نەبوو.

ئەو دەیگوت: هەمدیسانەوە دانیشتویت و سەرت بەسەر کتێبێکدا شۆڕکردۆتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە هێندە بچکۆلە و ڕەنگزەرد و ڕیوەڵەیت، چونکە ناتەوێت وەک منداڵانی تر لە دەرەوە بیت.

بێگومان دەچوومە دەرەوە ــ بگرە زۆربەی کات هەر لە دەرەوە بووم. بەڵام پوورە ئیدلا و مام سیکستن دەیانوسیت هەمیشە هەر لە کۆڵان بم و نەڕۆمەوە ماڵەوە. بۆیە پێم وایە، ئێستا ئەوان زۆر شادن بەوەی کە ئیتر قەت سەر بەو ماڵەدا ناکەمەوە.

تەنیا بە ئێواران، هەوڵم دەدا تۆزێک بخوێنمەوە، لەبەر ئەوەش نەبوو کە من رەنگزەرد و ڕیوەڵە بووم. خۆزگە پوورە ئیدلا بیبینیایە کە ئێستا چەند گەورە و بەهێز و گەنمڕەنگ و لەشساغم. ئێستا لەبەر تیشکی خۆردا قاڵبووم و هێندە بەهێزم، هەر مەپرسە. ئەگەر دەستێکیشم لەپشتەوە ببەسترێتەوە، دەتوانم یاننی بدەم بە ئەرزدا، ئەگەر ئێستا لە ماڵەوە لە ئوپلاندسگاتان بوومایە. بەهەرحاڵ ئەمە ناکەم، چونکە نامەوێ و حەزم لێی نییە.

دەپرسم ئاخۆ پوورە ئێدلا بڵێ چی، ئەگەر ببیستێ کە بیرێک هەیە بە ئێواران دەچپێنێ. یاخۆ ئەگەر گوێی لێ بێ، کە هیچ پێویست ناکا ئێواران دابنیشی و سەر بەسەر کتێبێکدا شۆڕ بکەیتەوە و زەرد هەڵگەڕێی بۆ ئەوەی حیکایەت بخوێنیتەوە، بەڵکو دەتوانی لە دەرەوە لە هەوای ئازاددا بیت و لەگەڵ ئەوەشدا چەندێ دڵ بیەوێ و حەز بکەی ئەوەندەش گوێت لە راز و حیکایەت بێت. رەنگە پوورە ئێدلاش ئەمەی پێ باش بێت، چونکە ئەو، وەکو تر، بە هیچ شتێک ڕازی نییە.

نا، تەنیا هێندە بەسە کە ئەو بزانێ لە وڵاتی دوور بیرێک هەیە بە چرپە ڕاز و حیکایەت دەگێڕێتەوە.

هەبوو نەبوو کوڕەپاشایەک هەبوو، لەبەر تریفەی مانگەشەودا بە سواری ڕێگەی دەبڕی. بە سواری بەنێو دارستانە تاریکەکەدا رۆیی…

بیرەکە ئاوای وت. منیش نەمتوانی بیری لێ نەکەمەوە. من لای خۆمەوە وامدەزانی بیرەکە مەبەستێکی تایبەتی لە گێڕانەوەی ئەو ڕازەدا هەبوو. ئەوەیش ئەوەیە کە من ئەو کوڕەپاشایە بووم کە بە سواری دارستانە تاریکەکەی بڕیبوو، پێویستە کە جارێکی دیش دووبارەی بکاتەوە. کە بیرەکە سەرلەبەری ئێوارەیەک ڕازی بۆ من دەگێڕایەوە و گۆرانی بۆ دەگوتم، مەبەستی ئەوە بوو ئەوەم بیر بخاتەوە کە پێویستە بیکەم.

من لە بابەشام پرسی، ئاخۆ دەزانێ دارستانە تاریکەکە لەکوێیە، ئەو دەیزانی.

ـ دارستانە تاریکەکە لە وڵاتی ئەودیوی چیاکانەوەیە، ئەو وای وت و هەست بە خەمناکییەکی زیاتر دەکرا لە دەنگیدا. بۆ دەتەوێ ئەمە بزانی میۆ میۆکەی من؟

ـ دەمەوێ ئەمشەو کە مانگە هەڵهات بە سواری بچم بۆ ئەوێ.

بابەشام بە شێوەیەکی وا سەیر تێی ڕوانیم و وتی:

ـ ئەئاوا، هەر وا زوو. دەنگی خەمناکتر بوو.

من وتم: ڕەنگە تۆ حەز لەمە نەکەی، ڕەنگە بکەویتە غایلە و ختوورەکردن، ئەگەر شەو بە سواری بەنێو دارستانە تاریکەکەدا بڕۆم.

بابەشام سەری راوەشاند و وتی:

ـ نەء، بۆچی دەبێ وابم. دارستانێک کە بەهێمنی لەبەر تریفەی مانگەشەودا بنوێ، شتێکی خراپی لێ ناوەشێتەوە.

بەڵام دوایی بە بێدەنگی دانیشت و سەری خستە ناو دەستی و، پێوەی دیار بوو کە بیر لە شتێکی خەمهاوەر دەکاتەوە. لێی چوومە پێشەوە و باوەشم پێدا کرد تا دڵخۆشیی بدەمەوە و وتم:

– دەتەوێ هەر لە ماڵەوە بم و لات بمێنمەوە؟

ئەو قەیرێ سەیری کردم و چاوەکانی وەها خەمناک بوون.

ـ نەء، میۆ میۆکەی من، نابێ بمێنیتەوە. ئەوەتا مانگ بە بەرزایی ئاسمانەوەیە و دارستانە تاریکەکەش چاوەڕێت دەکات.

وتم: بە ڕاستیتە کە نارەحەت نابیت.

وتی: ئا، بەڕاستمە و، دەستی هێنا بە سەرما. ئیتر من ڕامکرد بۆ

ئەوەی لە یوم- یوم بپرسم ئاخۆ دەیەوێ لەگەڵمدا بێت بۆ دارستانە تاریکەکە. بەڵام هێشتا دوو هەنگاوم هەڵنەهێنابۆوە، بابەشام هاواری لێکردم:

- میۆ، میۆکەی من!

ئاوڕم دایەوە و بینیم ئەو لەوێ وەستابوو، باسکەکانی بۆ واڵاکردبوومەوە، من بەپەلە گەڕامەوە و خۆم هاویشتە باوەشی، ئەویش توند توند و بۆ ماوەیەکی زۆر باوەشی پێدا کردم و بە خۆیەوەی نووساندم.

وتم: هێندە نابات دەگەڕێمەوە.

- ئاوا، دێیتەوە. بابەشام بە چپە وتی بە جۆرێک کە بە حاڵ دەنگی دەبیسترا.

یوم-یومم لە بەردەم ماڵی باخەوانەکەدا بینیەوە و پێم وت کە نیازمە بەسواری بەناو دارستانە تاریکەکەدا بڕۆم.

یوم-یوم وتی: ئاوا، ئاخرییەکەی.

من تێنەگەیشتم، بۆچی کە وتم دەمەوێ دارستانە تاریکەکە تەی بکەم، بابەشام وتی: "هەروا زوو" و یوم-یومیش وتی: "ئاوا، ئاخرییەکەی". بەڵام من گوێم نەدایە و بیرم پێوە مەشغوڵ نەکرد.

بە یوم-یومم وت: لەگەڵم دێی.

یوم-یوم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی: ئا... ئا... ئا

میرامیس لە باخی گوڵاندا دەلەوەڕا، چووین هێنامان و من پێم وت دەبێ بمانگەیەنێتە دارستانە تاریکەکە. ئیتر میرامیسم میرامیس،

وەک ئەوەی لە دەمـــێکەوە هـەواڵی وا خـــۆشی بـەر بای گـــوێ نەکەوتبێت، کەوتە سەماکردن. هەر هێندەش من و یوم-یوم خۆمان هاویشـتـە سـەر پشـتی، وەک برووسکە ڕێگای گـرتە بەر و تێی تەقاند.

کە لە باخی گوڵان ئاودیو بووین، گوێم لە هاواری بابەشام بوو:

ـ میۆ، میۆکەی من، هاواریکرد، قەت لەوەوپێش دەنگی وا کسپە لە دڵەوە هێنم نەبیستبوو، بەڵام نەمتوانی بگەڕێمەوە دواوە، نەمتوانی. وڵاتی ئەودیوی چیـاکـان زۆر دوور بوو، بەبێ ئەسـپـێکی وەک مـیـرامـیس نەمـاندەتوانی بگەینە ئەوێ. نەک هەر ئەوە، بەڵکە نەشمـاندەتوانی بەو شـاخ و بەندەنانەدا هەڵزنێین، کە هێندە بەرز بوون، سـەریان لە هەوران دەسـوو. بەڵام بۆ مـیـرامـیس ئەوە چ هونەرێک نەبوو. ئەو بەسـەر تاوێر و ڕکی ئەو شاخانەدا قـەڵەمبازی دەدا و وەک باڵندە دەفـڕی. من تۆزێ لەسـەر بەرزترین لووتکە، کـە هەرگـیـز بەفـری لێ نەدەچۆوە، وەسـتـاندم. لەوێدا بەسـەر پشـتی میرامـیسەوە بووین و سـەیری ئەو وڵاتەمـان دەکرد کـە لـە دامـێنی چیاکـەدا چاوەڕێی دەکردین. مـانگ بەسـەر دارسـتـانە تـاریکەکەوە دەدرەوشایەوە، جوان دەینـواند و بە هیـچ جۆرێکیش ترسناک نەبوو. جـا بە ڕاسـتـیش هەروا بوو، دارسـتـانێک کـە لەبەر تریفـەی مـانگەشـەودا پاڵ کـەوتبێت، هیـچ خراپەیەکی لێ ناوەشـێتـەوە. ئا، بابەشام لەسەر هەق بوو، لێرە نەک هەر مرۆڤ، بەڵکە هەموو شتێک مـیـهـرەبان و دۆسـتـانە بوو. دارسـتـان و مـێـرگ و جـۆگـە و

شیناوەردەکانیش هەر میهرەبان و دۆستانە دەیاننواند و بۆنی هیچ مراپەکارییەکیان لێ نەدەهات. شەویشی هەروەک رۆژ میهرەبان بوو، مانگیش وەک خۆر بە نەرمونیانی دەدرەوشایەوە و تاریکییەکەش تاریکییەکی ترسێنەر نەبوو. هیچ شتێک نەبوو بگەی مەترسی بێت.

تەنیا یەک شت هەبوو پیاو لێی بترسێت. تەنیا یەک شت.

کاتێ ئێمە بە کۆڵی میرامیسەوە بووین، وڵاتێکم دی دوور زۆر لەولای دارستانە تاریکەکەوە، لەوێ شەوەزەنگ بوو، شەوەزەنگێکی دارستانە و ئاساییش نەبوو. پیاو کە سەیری دەکرد نەیدەتوانی لەرساندا نەلەرزێ.

بە یوم-یومم وت: ئەوە چ وڵاتێکی ترسناکە،

یوم یوم وتی: وڵاتەکەی نزیکمان لەوێوە دەست پێ دەکات، ئەوە سنوورەکانی وڵاتەکەی نزیکمانە.

ئەم وڵاتەکەی سوارەکاتۆ.

میرامیس، وەک ئەوەی لەسەرماندا تەزیبێ، کەوتە حەشۆکە و لەرزین، گابەردە زلەکانی چیاکانیش لەجێی خۆیان ترازان و بە زرمە و ناڵە بەرەو دۆڵەکەی خوارمان گلۆربوونەوە.

تا، تەنیا کەسێکی ترسناک هەبوو، ئەویش سوارەکاتۆ بوو. مرۆڤ دەبێ لەو بترسێ، زۆر بترسێ، زۆر زۆر. بەڵام من نەمدەویست چیتری بیر لەو بکەمەوە.

بە یوم-یومم وت: دارستانە تاریکەکە، من دەمەوێ هەر ئێستا بەرەو دارستانە تاریکەکە بڕۆم.

ئەوکاتە میرامیس حیلاندی و، حیلەی لەنێوان ترۆپکی چیاکاندا بەرز و نائاسایی ئاوازەی دەدایەوە. دوایی بە هێواشی بەهەوادا بەرەو دارستانی بەر تریفەی مانگەشەو کە کەوتبووە دامێنی چیاکەوە شۆڕبووەوە. لە دارستانەکەشەوە سەدایەک هات، وەک ئەوەی سەدان ئەسپ پێکەوە لەو شەوەدا بحیلێنن.

ئێمە تا دەهات زیاتر بەرەوخوار شۆڕدەبووینەوە، بە جۆرێک کە زۆر بە نەرم و نیانی سمی میرامیس لە پۆپەی درەختەکان دەخشا. پاشان بەنێو چڵە سەوز و گەڵا چرپرەکانی درەختەکاندا لەسەر زەوییەکە نیشتینەوە و گەیشتینە دارستانە تاریکەکە.

پێشتر قەت لە ژیانمدا دارستانی زۆرم نەدیبوو، بەڵام دارستانی وەک ئەوەی ئێرە، لە هیچ شوێنێ وێنەی نییە. دارستانە تاریکەکە نهێنییەکی تایبەت بە خۆی هەبوو. نهێنییەکی گەورە و سەیر لەوێدا هەبوو، هەستم بەوە دەکرد، بەڵام مانگ بە جاجمێکی چوارچمک ئەو نهێنییەی داپۆشیبوو، کە، تا ئەو کاتەش، هیچم لێی نەدەزانی. خشوهوڕی گەڵای درەختەکان، ئەو نهێنییەیان بۆ یەکتر دەچرپاند، بەڵام من هیچ تێ نەدەگەیشتم. درەختەکان بە ئارامی لەوێ وەستابوون و لەبەر تریفەی مانگدا دەدرەوشانەوە و نهێنییەکەیان دەزانی، بەڵام من لێی بێخەبەربووم.

لەپڕدا لەدوورەوە دەنگی سمکۆڵی چەند ئەسپێکمان هاتە بەر گوێ. وەک ئەوە وابوو سەدان ئەسپ لەو شەوەدا غاربکەن، کاتێکیش میرامیس حیلاندی لەوە دەچوو سەدان ئەسپ پێکەوە لە وەڵامی

ا بحیلێنن. دەنگی سمی ئەسپەکان تا دەهات نزیکتر دەبووەوە،
لەی ئەسپەکانیش تا دەهات بەرزتر دەهاتە بەر گوێ، هەر
.ەمان زانی بەسەر سەری ئێمەوە بوون، سەد ئەسپی سپی کە
کانیان وەک باڵی میرامیس دەشەکایەوە. میرامیس، یەکسەر،
ی کرد بەناو ڕەوە ئەسپەکەدا و هەموو پێکەوە بەنێو شوێنێکی
تەنەی کراوەی ناو دارستانەکەدا ڕێگەیان گرتەبەر. من و
-یوم لە پشتی میرامیس دابەزین و لە سای درەختێکدا
هستاین و دەمانڕوانییە گشت ئەو ئەسپە سپییانە کە میرامیس
بووە سەرڕەویان و بەلەسە لەبەر تریفەی مانگدا بەو نێوەدا بە
دەهاتن و دەچوون.
-یوم وتی: ئەوان زۆر دڵخۆشن.
ۆچی دڵخۆشن.
-یوم وتی: لەبەر ئەوەی میرامیس گەڕاوەتەوە زێدی خۆی.
.ەزانی کە میرامیسیش لە دارستانە تاریکەکەوە هاتووە؟
ە، نەمدەزانی.
-یوم وتی: میۆ، تۆ زۆر کەم دەزانی.
نیم: باشە چۆن بوو میرامیس بوو بە هی من.
اشامان ڕایسپارد کە دەبێ یەکێ لە جوانووە سپییەکانی
ردرێت بۆ دوورگەی سەوزەمێرگان و ببێ بە ئەسپی تۆ.
سەیری میرامیسم دەکرد، کە چۆن لەبەر تریفەی مانگدا غاری
ڕد و دەماخی هەبوو، یەکسەریش پەشێوی دایگرتم.



من و یوم–یوم ئەسپە سپییەکانمان دی، لەبەر تریفەی مانگدا بەو نێوەدا بە غار دەهاتن و دەچوون.



پرسیم: یوم-یوم، تۆ لەو باوەڕەدایت میرامیس بێتاقەت بێ بەوەی
کە ناچارە لای من بمێنێتەوە، ڕەنگە غەریبیی دارستانە تاریکەکە
بکات و بیەوێت بۆ ئەوێ بگەڕێتەوە.
کە ئەمەم وت، میرامیس بە غارکردن خۆی گەیاندە بەردەمم و

سەری خستە سەر شانم، بۆ ماوەیەکیش جوولەی لە خۆی بڕی و تەنیا تۆزێ بە نزمی حیلاندی.

یوم-یوم وتی: - ئەوەتا دەیبینی کە لای تۆی پێ خۆشترە.

من بەوە خۆشحاڵبووم. دەستێکم پێدا کێشا و کلۆشەکرێکم لەسەر دەستم بۆ ڕاگرت، کاتێ بردی لمۆزی بەر لەپی دەستم کەوت، زۆر نەرم و شل بوو.

پاشان بەرەوپێش دارستانەکەمان بڕی و سەد ئەسپە سپییەکەش دوامان کەوتبوون. من لە هەوادا هەستم بە نهێنییەکە کرد. سەرتاسەری دارستانەکە بەو نهێنییەی دەزانی، یەک بە یەکی



درەختەکان، هەموو سپیندار و زیزەفۆنە سەوزەکان کاتێ بە سواری بەنێویاندا ڕەتدەبووین و گەڵاکانیان بەنەرمییەوە بەسەرمانەوە دەشەکانەوە، بەو نهێنییەیان دەزانی. ئەسپە سپییەکان و، ئەو باڵندانەش کە لە زرمەی سمی ئەسپەکان بێدار دەبوونەوە، بەو نهێنییەیان دەزانی. هەموو بە نهێنییەکەیان دەزانی تەنیا من نەبێ. یوم-یوم هەقی بوو کاتێ وتی: -تۆ زۆر کەم دەزانی، میۆ.

من بەناو درەختەکاندا دەستم بە غارکردن کرد، ئەسپە سپییەکانیش بەدوامدا. زۆر بە خێرایی دەڕۆیشتین. فەرەنجییە سوورەکەی پشتم لە چڵی درەختێک گیربوو. ڕەنگە درەختەکە ویستبێتی ڕامگرێ، دوور نییە ویستبێتی باسی نهێنییەکەم بۆ بکات. بەڵام من زۆر بەپەلە بووم. لەسەر غارکردن بەردەوام بووم و، کونێکی گەورەش بووە فەرەنجییەکەم.

لە ناوەڕاستی دارستانەکەدا خانوویەک هەبوو، خانوویەکی بچکۆلەی سپی ئەفسانەیی کە سەربانەکەی بە پووش و پەڵاش داپۆشرابوو. دارسێوی زۆریش بە دەوریدا ڕووابوو. گوڵی سپی سێوەکان لەبەر تریفەی مانگدا دەدرەوشانەوە. پەنجەرەیەک لەسەر پشت بوو، دەنگە دەنگیش لە ژوورەوە دەبیسترا. وەک ئەوە وابوو کەسێک لە ژوورەوە دانیشتبێ، مەکۆی هەڵخستبێ و خەریکی چنین بێ.

بە یوم-یومم وت: با بزانین کێیە خەریکی چنینە.

یوم-یوم وتی: بابزانین.



له میرامیس دابەزین و ئەو ڕێچکەیەمان گرتەبەر، کە بەناو دارستێوەکاندا بەرەو خانووەکە دەچوو. لە دەرگامان دا و کوتوپڕ دەنگەکە نەما.

ــ وەرنە ژوورەوە، پیاوە چکۆلەکان، یەکێک وای وت. زۆر دەمێکە چاوەڕێم.

چووینە ژوورەوە، و لەوێ ژنەجۆلایەک لەپاڵ مەکۆکەیدا دانیشتبوو. زۆر دڵسۆز و میهرەبان دیار بوو، سەرێکی بۆ بادایین.

من لێم پرسی: بۆ بەم شەوە بەخەبەریت و جۆلایی دەکەی.

وتی: من خەونەقوماش دەچنم، ئەویش تەنیا پیاو بەشەو دەتوانێ بیکا.

تیشکی مانگ لە پەنجەرەکەوە دەیدا لە پارچەقوماشەکەی و
دەدرەوشایەوە، قوماشەکەش لەبەر ئەو تیشکەدا هێندەی تر جوان
دەینواند.

ەو وتی: چنینی ئەفسانەیی و خەونەقوماش هەر بەشەو دەکرێن.

ایم پرسی: لە چی دەیچنی وا ئەوەندە جوانە.

وەلامی نەدایەوە و دەستی کردەوە بە چنین. مەکۆکەی خستەوە کار
و لەبەرخۆشیەوە گۆرانی دەوت:

*ۆ تیشکی مانگ، تیشکی مانگ، خوێنی سووری دڵ،*

*یو، زیو و ئەرخەوان،*

*گوڵەستێو، گوڵەستێو، تەونەکەم نەرم و شل کە،*

*ەرموشلتر لە بای شەوی نێو گژوگیا.*

*ەلام باڵندەی خەم بەسەر دارستانەکەوە دەخوێنێ.*

زم و یەک ئاوازە و لەبەرخۆیەوە گۆرانی دەگوت، هێندە خۆشیش
ەبوو. بەڵام کاتێ لێ بووەوە، لە دارستانەکەوە دەنگی گۆرانییەکی
ر هات، کە هەمتر ناسیمەوە. وەک ژنەجۆلاکە وتی، ئەوە باڵندەی
خەم بوو بەسەر دارستانەکەوە دەیخوێند. لەسەر پۆپەی درەختێک
هەڵنیشتبوو، بە جۆرێک دەیخوێند کە دڵی تەنگ دەکرد.

ە ژنەجۆلاکەم پرسی: باڵندەی خەم بۆ دەخوێنێ؟

ئەو گریا و، فرمێسکەکانی کەوتنە سەر قوماشەکە و بوون بە چەند
دەنکەمروارییەکی بچووک لەسەری، بە شێوەیەک کە ڕێسەکەیان لە
جاران زۆر جوانتر کرد.

جارێکی تریش لێم پرسییەوە: باڵندەی خەم بۆ دەخوێنێ؟
ژنەجۆڵاکە دایە پرمەی گریان و وتی: کچە بچکۆلەکەی من دەلاوێنێتەوە، بە باڵای کچە فڕێنراوەکەی مندا هەڵدەڵێ.
لێم پرسی: کێ کچە چکۆلەی تۆی فڕاندووە؟
من ئیتر ئەوەم دەزانی و، پێویستیش بەوە نەبوو گوێم لێ بێ.
وتم: ناوی مەهێنە.
ژنەجۆڵاکە وتی: نەء، چونکە تریفەی مانگ دەکوژێتەوە. تریفەی مانگ نامێنێ و نۆما سپییەکانیش لە گریاندا فرمێسکی خوێن هەڵدەڕێژن.
پرسیم: بۆچی فرمێسکی خوێن هەڵدەڕێژن؟
ژنەجۆڵاکە وتی: بۆ ئەو نۆما بچکۆلەیەش کە فڕێنراوە. گوێت لێیە باڵندەی خەم چۆن بەسەر دارستانەکەوە دەخوێنێ و دنیای پڕ کردووە لە لاواندنەوە!
من لە ناوەڕاستی خانووەکەدا وەستابووم و لە پەنجەرە کراوەکەوە گوێم لێ بوو چۆن لە دەرەوە باڵندەی خەم دەیخوێند. لەوەوبەر چەندین ئێواران لە باخی گولاندا بۆ من خوێندبووی، بەلام تێنەگەیشتبووم لەبارەی چییەوە دەیخوێند. ئێستا ئیتر لێم ئاشکرا بوو. ئەو لەبارەی هەموو ئەوانەوە کە بۆ دوور فڕێندرابوون، لە بارەی کچە چکۆلەی ژنەجۆلاوە، لەبارەی براکانی نوونوووەوە، لەبارەی خوشکەکەی یرییەوە و لەبارەی هەموو فڕێنراوەکانی ترەوە دەیخوێند، کە سوارەکاتۆی بەدکار فڕاندبوونی و لە قەلاکەیدا حەپسی کردبوون.

هەر بۆیە لە گشت کوخە بچکۆلەکانی دوورگەی سەوزەمێرگان و لە وڵاتی ئەوبەری ئاو و ئەودیوی چیاکانەوە خەڵکی خەمبار بوون. خەڵکی بۆ منداڵانی خۆیان دەلاوانەوە و لە پەژارەی گشت ئەو منالانەدا بوون کە فڕێنرابوون. تەنانەت ئەسپە سپییەکانی نێو دارستانە تاریکەکەش کەسێکیان هەبوو بیلاوێننەوە و ئەوانیش، هەر کە ناوی چەتەکەیان دەبیست، فرمێسکی خوێنینیان دەباراند.
سوارەکاتۆ! من ئەوەندە لە سوارەکاتۆ دەترسام، ئەوەندە دەترسام هەر مەپرسە! بەڵام کاتێک لەناو کوخەکەدا وەستابووم و گوێم لە خوێندنی باڵندەی خەم بوو، شتێکی زۆر سەیر و تایبەت لە مندا روویدا. لەپڕدا لێم ئاشکرا بوو من بۆ ئەمشەو رێی دارستانە تاریکەکەم گرتەبەر. لەوسەری دارستانە تاریکەکەوە سنووری وڵاتی نزیک دەستی پێ دەکرد. لەڕاستیشدا دوامەنزڵی من هەر ئەوێ بوو. دەبوو بچمە وڵاتی نزیک و لەگەڵ سوارەکاتۆدا بجەنگم، هەرچەندە زۆر زۆر لە سوارەکاتۆش دەترسام. هێندە دەترسام، کاتێ بیرم لەوە دەکردەوە چیم لە پێشە و دەبێ چی بکەم، دەمویست بدەمە پرمەی گریان.
ژنەجۆلاکە دەستی کردەوە بە چنین. لەبەرخۆشیەوە گۆرانییە یەک ئاوازەکەی "هۆ تیشکی مانگ، تیشکی مانگ، خوێنی سووری دڵ"ی دەوتەوە و چیتر من و یوم-یومی لە بیر نەما.
- یوم-یوم، من وتم و، دەنگیشم هێندە نائاسایی و غەریب بوو، یوم-یوم، من هەر ئێستا بەرەو وڵاتی نزیک دەڕۆم.

یوم-یوم وتی: دەزانم.
زۆر سەرم سووڕما.
وتم: چۆن دەزانی، من خۆم نەختێ لەمەوپێش نەمدەزانی.
یوم-یوم وتی: میۆ، تۆ زۆر کەم دەزانی، میۆ.
وتم: بەڵام تۆ، تۆ هەموو شتێک دەزانی.
ـ ئا، من دەمێکە دەزانم، کە تۆ دەبێ بەرەو وڵاتی نزیک بڕۆی، هەموو کەس دەزانن.
ـ هەموو کەس؟
یوم-یوم وتی: ئا، باڵندەی خەم دەزانێ. ژنەجۆڵاکەی ئێرەش دەزانێ. سەد ئەسپە سپییەکەش دەزانن. هەموو دارستانە تاریکەکە دەزانێ، درەختەکان، گژوگیا و گوڵەسێوەکانی ئەم نزیکانە ئەوە دەچرپێنن، هەموو دەزانن.
ـ بەڕاست!
ـ یەک بە یەکی شوانەکانی دوورگەی سەوزەمێرگان ئەوە دەزانن و شەوانە شمشاڵ بۆ ئەوە لێ دەدەن. نوونوو دەزانێ. نەنکی نوونوو، یری و خوشک و براکانی یریش دەزانن. ئەو بیرەی شەوانە دەچپێنێ دەزانێ. با بزانیت، هەر هەموویان دەزانن.
من چپاندم: ئەی بابەشام...
یوم-یوم وتی: بابەشات هەمیشە زانیویەتی.
وتم: بەڵام ئاخۆ دەیەوێ بڕۆم. نەشمتوانی لێوەلەرە و لەرزەی دەنگم بشارمەوە.

یوم-یوم وتی: ئا، دەیەوێ، ئەو بێئارام و خەمبارە، بەڵام دەشیەوێ برۆی.

- نا، بەڵام من زۆر دەترسم، وام گوت و دەستم کرد بە گریان. چونکە تا ئەو کاتە بەتەواوی هەستم بەوە نەکردبوو چەندێ دەترسام. لەترسانا، قۆڵی یوم-یومم گرت.

وتم: یوم-یوم ناوێرم، بۆچی بابەشام دەیەوێ ئەمە بکەم.

یوم-یوم وتی: شازادەیەکی لە بنەچە و تۆرەمەی شاهانە تەنیا کەسێکە کە بتوانێ ئەمە بکات، تەنیا شازادەیەکی ئا لەو چەشنە دەتوانێ ئەمە بکات.

- نەی ئەگەر ئەمە مەرگمی پێوە بێ، وام وت و بەتوندی قۆڵی یوم-یومم گرت.

ئەو وەڵامی نەدایەوە.

- بابەشام لە هەموو حاڵێکدا هەر دەیەوێ من برۆم؟

زنەجۆڵاکە دەستی لە چنین هەڵگرت، کوخەکەش بەتەواوی کش و مات بوو. باڵندەی خەم بێدەنگ بوو. چیتر گەڵای درەختەکان نەجووڵانەوە، خشەیەک چی بوو نەدەهات. هەر بەیەکجاری کش و ماتی ئەو ناوەی داگرت.

یوم-یوم سەری بادا و وتی: ئا، بەڵام هێند بە نزمی وتی کە بە ئاستەم گوێم لێ بوو. بابەشات دەیەوێ لە هەموو حاڵێکدا هەر برۆی.

ئیتر من بەتەواوی پەشۆکام.

ـ ناوێرم، هاوارم کرد. ناوێرم! ناوێرم!

یوم-یوم هیچی نەگوت. تەنیا سەیری کردم بەبێ ئەوەی تەنیا وشەیەک چییە لە زاری بێتە دەرەوە. بەڵام باڵندەی خەم دەستی کردەوە بە خوێندن، گۆرانییەکی دەچڕی کە نزیک بوو دڵم بوەستێنێ.

ژنە جۆڵاکە وتی: ئەوە بۆ کچە بچکۆلەکەی من دەخوێنێ و، فرمێسکەکانیشی کەوتنە سەر چاوەکەی بەردەمی و بوون بە مرواری.

توند دەستەڕکانی خۆمم گوشی و وتم: یوم-یوم، هەر ئێستا دەڕۆم. دەچم بۆ وڵاتەکەی نزیکمان.

ئەوسا هاژەیەک بەناو دارستانە تاریکەکەدا ڕۆی و، چریکەیەکی وا لە باڵندەی خەمەوە هات٠کە لە هیچ دارستانێکی دنیادا نەبیسترابوو.

یوم-یوم وتی: ئەمەم دەزانی.

ـ بە دوعا، یوم-یوم، ئەمەم وت و هەستم کرد کە دەمەوێ بدەمەوە پڕمەی گریان. بە دوعا، یوم-یوم گیان!

ئیتر یوم-یوم سەیری کردم و، چاوەکانیشی هێندە دۆستانە بوون، هەر لە چاوەکانی بێنکا دەچوون. زەردەیەکیش گرتی.

وتی: من لەگەڵت دێم.

ئەو هاوڕێی من بوو، لەڕاستیدا هاوڕێی من بوو. زۆر شاد بووم کاتێ وتی لەگەڵتا دێم. بەڵام من نەمویست، ئەو تووشی هیچ بەڵایەک ببێت.

: نەء، یوم-یوم، تۆ نابێ، بۆ ئەو جێیەی بۆی دەڕۆم، شوێنم
وی.
-یوم وتی: لەدوات دێم. شازادەیەک کە خوێنی شاهانە لە
میدا دەگەڕێ و بە سواری ئەسپێکی سپیی یاڵزێڕین و لەگەڵ
یا یاوەرێکدا، ئەئاوا وتراوە. تۆ ناتوانی بڕیارێکی هەزاران
زار ساڵ لەمەوپێش بگۆڕی.
جۆلاکە وتی:
هەزاران هەزار ساڵ. لەبیرمە، ئەو ئێوارەیەم لە بیرە، کە
امەسێوەکانم دەڕواند و با گۆرانیی بەوەدا هەڵدەگوت،
ختانێکی زۆر پێش ئێستە بوو. بەر لە هەزاران هەزار ساڵ بوو.
سەرێکی بادا و، پاشان وتی:
یۆ وەرە با فەرەنجییەکەت بۆ بدرووومەوە.
اوەکەی دادڕی و پارچەیەکی لێ کردەوە و بەو شوێنە دڕاوەدا
درووو کە پێشتر، کاتێک بەناو دارستانە تاریکەکەدا هاتبووم،
تبووە فەرەنجییەکەم. ئا، ئەو فەرەنجییەکەمی بە پارچەیەکی زۆر
سکەدار دوورییەوە و فەرەنجیش زۆر سووک و نەرموشل و گەرم
ەر شانمدا هاتبووە خوارەوە.
جۆلاکە وتی: جوانترین پارچە جاوی خۆم دەدەم بە کەسێ کە
ە بچکۆلەکەم رزگار بکات. هەروەها ئەو نانەیش، کە برسییان
دەکا. چاک هەڵی بگرە! چونکە برسێتیت دێتە ڕێ.
ی دامێ و منیش سوپاسم کرد. پاشان رووم کردە یوم-یوم.

ـ ئامادەین، یوم-یوم؟

یوم-یوم وتی: ئا، ئامادەین.

لە دەرگاکەوە چووینە دەرەوە. ڕێچکەی نێوان دارسێوەکانمان گرتەبەر. سواری ئەسپەکەمان بووین. باڵندەی خەمیش باڵە ڕەشەکانی خۆی بەرزکردەوە و بەرەو چیاکان لە شەقەی باڵی دا.

سەد ئەسپە سپییەکانیش بە ئارامی وەستابوون و، کاتێک بەناو درەختەکاندا ڕەتدەبووین، لە ئێمەیان دەڕوانی. دوامان نەکەوتن. گوڵی سێوەکان لەبەر تریفەی مانگدا وەک بەفر دەبریسکانەوە. وەک بەفر دەبریسکانەوە... ڕەنگە ئیتر هەرگیزاوهەرگیز گوڵەسێوی وا سپی و جوان نەبینمەوە.

# باڵندە سیحرلێکراوەکان

پێم وابوو هەرگیز گوڵی سێو و داری سەوزی بە لەرە و لەرزە و گژوگیای نەرموشل نەبینمەوە. چونکە بەرەو وڵاتێک دەڕۆیشتین، کە نە گوڵی لێ بوو و، نە درەخت و گژوگیای لێ دەڕوا.

شەو، بە سواری بەڕێوە بووین. ڕۆیشتین و ڕۆیشتین. دارستانی بەر تریفەی مانگمان بەجێهێشتبوو و، لەوێش هیچ دارستانێکی لەو چەشنەی لێ نەبوو. لەپێشمانەوە تاریکی داهات. تریفەی مانگ کوژایەوە، زەوی بەردەڵان و ڕەقەن بوو و، زنار و تاوێرە رووتەکانیش هەموو ئەو ناوەیان گرتبۆوە. تا دەهات زیاتر لێمان نزیک دەبوونەوە. لەدواییدا بەناو دەربەندێکی تەنگەبەر و تاریکدا، کە کەوتبووە نێوان دوو کەپکە چیای بەرز و رەشەوە، رۆیشتین.

یوم-یوم وتی: ئەگەر ڕێگاکە وا تاریک نەبووایە، ئەگەر چیاکان وا رەش نەبوونایە و ئێمەش وەها بچووک و تەنیا نەبووینایە.

ڕێگاکە خۆی پێچ و لوول دابوو، وەک ئەوەی وا هەست دەکرا، کە هەزاران مەترسی لە هەر پێچێکدا لە پارێزدا بێت بۆمان. میرامیسیش هەستی بەوە دەکرد. هەموو گیانی هاتبووە حەشۆکە و دەیویست بگەڕێتەوە. بەڵام من لغاوەکەیم توند گرت و زۆرم لێ کرد بەرەو پێش بڕوا. ڕێچکەکە باریکتر بۆوە. چیا ڕەشەکانیش کە ئەمبەر و ئەوبەریان گرتبوو، بەرزتر دەبوونەوە. تاریکییەکە چڕتر

بوو. لەدوایـیـدا گـەیشـتـنـە لای شـتـێک کـە لـە دەروازەیەک دەچوو، شوێنێکی کراوەی تەنگ لەناو زنارەکاندا. لە پشـتـەوەش رەشـایـیەک هەبوو کە لە هەموو دنیادا لە وێنەی نەبوو.

یوم-یوم چپاندی:

- وڵاتی نزیک. ئێرە دەروازەی وڵاتی نزیکە.

میرامـیس سمکۆڵی کرد. هەسـتـایە سـەر پاشـوو و، بە شـێـوەیەک حـیـلاندی کـە پیـاو توانای گـوێگـرتنی نەبوو. زۆر تـرسـێـنـەر بوو و، ئەوەش تـەنیـا شـتـێک بوو کـە دەهاتـە بەر گـوێ. چونکە تاریکیی ئەودیوی دەروازەکە زۆر کپ بوو. کپ بوو، وەک ئەوەی خۆی بۆ ئێمە مـەڵاس دابێ. دیار بوو کـە چاوەڕێی ئەوە بوو، تـا ئێـمـە ئـاودیوی سنوور ببین.

دەمـزانی کە دەبوو بچمە ناو ئەو تاریکییەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا ئەو ترسـەی جـارانم نەمـابوو. ئێـسـتـا کـە ئیـتـر دەمـزانی ئەوە پێش هەزاران هـەزار سـاڵ بڕیـاری لەسـەر دراوە کـە دەبوو بەنـاو ئەو دەروازە تاریکەدا بڕۆم، هـەسـتـم کـرد کـە لە جـاران ئازاتـرم. بیـرم کـردەوە، چش! چی دەبێ با ببێ! رەنگە قـەت سـەریش نەهێـنـمـە دواوە، بەڵام نەشم ویست چیدی بترسم.

میرامـیسم، بەرەو تاریکییەکە، ئاژوا. کاتێ هەستی کرد کە بە تەما نەبووم لێگەڕێم بابداتەوە، وەک بـەلـەسـەیەک، بەرەو ئەو رێـگا تاریکانـەی کـەوتـبـوونـە پشت دەروازەکـەوە، خـۆی بەنـاو دەروازە تەنگەبەرەکەدا کرد. بەخێرایی بەناو شەوەکەدا رۆیشـتین، هـەر چوار دەورمان تاریکی بوو، رێگاکەش بەڵەد نەبووین.

بەڵام یوم-یومم لەگــەڵدا بوو. لە پاشكۆمــدا بوو، زۆر بەتوندیش باوەشی پێدا كردبووم، لە هەموو جارێكیش زیاتر خۆشم دەویست. تەنیا نەبووم. هاوڕێیەكم لەگەڵدا بوو، تەنیا هاوڕێیەك، كتومت وەك ئەوەی وترابوو.

نازانم چەندێ ئێمە بەناو تاریكییەكەدا بەرەوپێشەوە تاومان دا. رەنگە چركەیەك، رەنگە چەندین سەعات بووبێ. یان رەنگە هەزاران هەزار ساڵ بووبێ، چونكە وا هەست دەكرا. لەوە دەچوو مرۆڤ لە خەوندا تاو بدات، خەونێكی ناخۆش، كە مرۆڤ بەدەم هاوارەوە لێی بێدار دەبێتەوە و، دوایی ڕادەكشێتەوە و تا ماوەیەكیش ترسەكە بەری نادا. بەڵام ئەمە خەونێك نەبوو كە لێی بێدار بیتەوە. ئێمە هەر دەمانئاژوا و دەمانئاژوا. نەماندەزانی بەرەو كوێ. نەمان دەزانی چەند دەخایەنێت. ئێمە تەنیا بەناو شەودا ڕێمان گرتبووە بەر و دەمانئاژوا.

لەئاخریدا، میرامیس ئیستێكی كرد و وەستا. گەیشتبووینە كەناری زەریاچەیەك. هیچ خەونێكیش لە گەیشتن بەو زەریاچەیە ترسناكتر نەبوو. جاروبار خەون بە ئاوی ڕەش و گەورەوە، كە لە بەردەممدا بێسنوور ڕاكشاوە، دەبینم. بەڵام هەرگیز نە من نە هیچ مرۆڤێكی دی خەونی بە ئاوێكەوە نەدیوە كە هێندەی ئەم ئاوەی لە بەردەممدا بوو ڕەش بێت. ئەوە رەشترین و تەریكترین ئاوی دنیا بوو. دەوروبەرەكەشی لە كاشەبەردی رووتەن و رەش و تەریك زیاتر هیچی لێ نەبوو. باڵندەكان بەسەر ئاوە ڕەشەكەوە ئەڵقەیان دابوو،



باڵندەیەکی یەکجار زۆر. پیاو نەیدەبینین بەڵام گوێی لێیان بوو.
هەرگیزیش گوێم لە قیژە و قیڕەی خەمناکی وەک ئەوەی ئەوان
نەبووە. ئای، چەندێ بەزەییم پیایاندا هاتەوە! لەوە دەچوو هاواری

بەهاناچوونیانەوە بکەن. لەوە دەچوو سەریان لێ شێوابێت و بگرین.
لەوبەری زەریاچەکەوە، بەسەر بەرزترین گاشەبەردەوە، قەڵایەکی گەورە و ڕەش هەبوو. تەنیا لە پەنجەرەیەکەوە رۆشنایی دەهات. ئەو پەنجەرەیەش لە چاوێکی بەدکار دەچوو، چاوێکی سووری تۆقێنەر کە بەسەر شەوەکەدا دەیڕوانی و نیازی لەگەڵ ئێمە خراپ بوو.
- قەڵاکەی سوارکاتۆ! ئەو لەوێ بوو، لەوبەری ئاوە ڕەشەکەوە دوژمنەکەی من دەژیا، ئەوەی من هاتبوومە جەنگی. ئەو چاوە بەدکارەی کە بەسەر زەریاچەکەدا دەیڕوانی ترساندمی، ئەگەرچی نەمدەویست چیتر بترسم. ترساندمی - چۆن دەبێ کەسێکی بچکۆلەی وەک من بتوانێ بەسەر کەسێکی بەدکار و ترسناکی وەک سوارەکاتۆدا سەر بکەوێ؟
یوم-یوم وتی: تۆ پێویستت بە شمشێرێکە.
هەر کە ئەوەی گوت، لەنزیکمانەوە، گوێمان لە دەنگی کڕوزانەوەیەک بوو.
- ئای... ئای... ئای... دەنگە پڕ لە سکاڵاکە وتی، خەریکە لەترساندا دەمرم، ئای... ئای... ئای!
تێگەیشتم کە خۆنزیککردنەوە لەو دەنگە سکاڵاکەرە مەترسی لەدوایە. دوور نەبوو کەسێک بێ کە بیەوێ فریومان بدا و بمانخاتە داوێکەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیرم کردەوە، هەر کەسێک بێ دەبێ بزانم کێیە و لەوە تێ بگەم ئاخۆ بەڕاستی پێویستی بە یارمەتی هەیە.

بە یوم-یومم وت: دەبێ بزانین کێیە. دەبێ یارمەتی بدەین.
یوم-یوم وتی: لەگەڵتا دێم.
- تۆش، میرامیس لێرە چاوەڕێ بە، من پێم وت و، دەستێکم بە دەمولووتیدا هێنا. ئەویش بە کەساسییەوە حیلاندی.
پێم وت: مەترسە. هێندە نابا دەگەڕێینەوە.
ئەوەی دەینالآند زۆر لێمانەوە دوور نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاسان نەبوو لەو تاریکییەدا بیدۆزینەوە.
- ئای... ئای... ئای، دەنگەکەمان کەوتەوە بەر گوێ. وا خەریکە لەبرساندا دەمرم، ئای... ئای... ئای!



بەرەو ئەو لایەی کە دەنگەکەی لێوە دەهات ڕۆیشتین، قاچمان لە چەند بەردێ هەڵکەوت، سەرسممان دا و کەوتینە ناو تاریکییەکەوە، بەڵام دواجار گەیشتینە بەر کوخێکی کۆن. ئەگەر پاڵی نەدابا بە زنارێکەوە، رەنگبوو خۆی بە پێوە پێ ڕانەگیرابا و دارمایە. لە دەلاقەیەکەوە رۆشناییەکی کز دەبینرا، بە پێدزکە خۆمان گەیاندە لای دەلاقەکە و لەوێوە سەیری ناوەوەی کوخەکەمان کرد. پیرەمێردێک لە ژوورەوە دانیشتبوو، پیرەمێردێکی بچکۆلەی لاوازی کلۆڵ، کە قژێکی بۆز و بژی هەبوو. ئاگردانەکەی دەگڕا و ئەویش لە بەردەمیدا دانیشتبوو و، دەلالایەوە و دەیگوت:

ـ ئای... ئای... ئای، لەبرساندا مردم، ئای... ئای... ئای!

ئەوجا چووینە ژوورەوە. پیرەمێرد هەر بە جارێ بێ دەنگ بوو، متەقی لێوە نەهات و سەیری ئێمەی کرد. لەبەر دەرگاکەدا راوەستاین و، پیرمێردیش بە جۆرێک سەیری دەکردین وەک ئەوەی قەت لەوەو پێش کەسێکی وەک ئێمەی نەدیبێ. دەستە پیر و لاوازەکانی خۆی بەرز کردەوە، کتومت وەک ئەوەی بترسێ.

بە دەنگێکی نزم وتی: هیچم لێ مەکەن، ئازارم مەدەن!

پێم وت، کە ئێمە بۆ ئازاردانی ئەو نەهاتووین.

وتم: ئێمە گوێمان لە دەنگی تۆ بوو، هاواری برسێتیت دەکرد، هاتووین بۆ ئەوەی نانت بدەینێ.

لەتێکم لەو نانەی ژنەجۆلاکە دابووی پێمان بۆ پیرەمێردەکە درێژ کرد. ئەو وەک پێشتر پیایدا ڕوانیم. من نانەکەم زیاتر نزیکی

خستەوە، بەڵام ئەو هێمانێ ترس بەری نەدابوو، زۆر دەترسا، هەروەک ئەوەی پێی وابێ کە من دەمویست بیخەمە داوێکەوە.

وتم: فەرموو، مەترسە!

ئەوسا دەستی بۆ نانەکە درێژ کرد و وەریگرت. بە هەردوو دەستی نانەکەی گرت و دەستی پێدا دەهێنا. بردی بۆ لای لووتی و بۆنی کرد. دوایی دەستی کرد بە گریان.

ـ ئەمە نانە، ئەو چپاندی. ئەو نانەی کە سکی برسی تێر دەکات.

ئیتر خواردی. قەت کەسێکم نەدیوە بەو جۆرە نان بخوات. لە نانەکەی دەخوارد و لەگەڵ خواردنیشیا دەگریا. کاتێ کە لێ بۆوە، هەرچی وردەنانێک کەوتبووە سەر جلەکانی هەمووی کۆکردەوە و کە هیچ نەما کۆی بکاتەوە، سەیری کردینەوە و وتی:

ـ لە کوێوە هاتوون؟ ئەمە نانی کوێیە؟ بۆ خاتری هەموو ئەو ڕۆژانەی بە برسێتی بەسەرم بردوون، پێم بڵێن لە کوێوە هاتوون؟

من وتم: لە وڵاتی دوورەوە هاتووین. ئەمە نانی ئەوێیە.

پیرەمێردەکە چپاندی: بۆچی هاتوون بۆ ئێرە؟

وتم: بۆ ئەوەی لە دژی سوارەکاتۆ بجەنگین.

هەروام گوت و، کابرا هاواری لێ هەستا و لەسەر کورسییەکەی کەوتە خوارەوە. وەک گلۆڵەیەکی بچکۆلەی بۆر بەسەر ئەرزەکەدا گلۆربووەوە و بە سنگەخشێ خۆی گەیاندە بەردەممان. لەبەر پێماندا کەوت و بە چاوە بچکۆلە ترساوە نیوەنوقاوەکانییەوە پێیدا ڕوانین و چپاندی: بە ڕێگەی خۆتاندا بگەڕێنەوە دواوە. بگەڕێنەوە، پێش ئەوەی کار لە کار بترازێ!

من وتم: ناگەڕێمەوە. من بۆ شەڕی سوارەکاتۆ هاتووم.
ئەمەم بە دەنگێکی بەرز و ڕوون و ئاشکرا وت. ئەوەندەی توانیشم، ناوی سوارەکاتۆم بە ڕێک و ڕەوانی وت و، پیرە تیلەیەکی تێ گرتم، وەک ئەوەی لاشەکەم بە مردوویی کەوتبێتە بەردەمی وابوو.
- ئای... ئای، نالاندی، بێ دەنگ بە! بێ دەنگ بە و بە ڕێگای خۆتدا بگەڕێرەوە، دەڵێم: بگەڕێرەوە پێش ئەوەی کار لە کار بترازێ.
وتم: ناگەڕێمەوە. هاتووم بۆ ئەوەی لەگەڵ سوارکاتۆدا بە شەڕ بێم.
- شش، پیرەمێردەکە وتی و لە ترساندا ڕەنگی پەڕیبوو. پێم وتیت: بێ دەنگ بە. جاسووسەکان لەوەیە گوێیان لێت بێ. ڕەنگە ئێستا لەودیوەوە خۆیان مەلاسدابێت.
خۆی تا دەرگاکە بەکێشکرد و بەترسەوە گوێی هەڵخست.
وتی: دەنگی هیچ نایەت، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە لەوێ بن. لەوەیە لێرە بن، لەوێ بن، لە هەموو شوێنێک بن. جاسووسەکان بلاون و، لە هەموو کون و قوژبنێ هەن.
لێم پرسی: جاسووسەکانی سوارەکاتۆ؟
پیرەمێردەکە چپاندی: کوڕە، بێ دەنگ بە. دیارە زۆر حەزت لێیە جوانەمەرگ بی؟ ناتوانی کڕ بی؟
لەسەر کورسییەکەی دانیشت و سەری بۆ خۆی دەلەقاند و وتی:
- نا، نا، ئەوەندە بە نزمییەوە وتی کە بە حاڵ دەهاتە بەر گوێ. جاسووسەکانی سوارەکاتۆ لە هەموو شوێنێ هەن، بە بەیانی، بە



ئێواره و به شەو. هەمیشه و له هەموو جێیەک هەن.

دەستی بۆ درێژ کردم و قۆڵی گرتم.

چپاندی: بۆ خاتری هەموو ئەو رۆژانەی به برسێتی بەسەرم بردوون، باوەڕ به کەس مەکە. جاری وا هەیه دەچیتە ماڵێک، لات وایه لەناو دۆست و هاورێیانی خۆتدای. بەڵام لەناو دوژمندای. ناپاکیت لەگەڵ دەکەن. دەتدەنه دەست ئەو پیاوەی لەو بەری زەریاچەکه دەژی. دەڵێم: متمانه به کەس مەکە. تەنانەت له منیش ئەمین مەبە! چۆن دەزانی، هەر هێنده پێت خستە ئەودیوی دەرگاکەوە، جاسووسەکانت شوێن ناخەم.

وتم: باوەڕ ناکەم تۆ وا بکەی.

پیرەمێردەکە چپاندی: کەس ناتوانێ دڵنیا بێ. قەت ناتوانی دڵنیا بیت.
بۆ ماوەیەک بە بێدەنگی دانیشت و بیریکردەوە.
وتی: نا، من سیخوڕ ناخەمە شوێنت، هێشتا، لەم وڵاتەدا، کەسانێکی وا ماون کە خیانەت ناکەن. هەندێکیش هەن کە خەریکی چەک دروستکردنن.
یوم-یوم وتی: پێویستمان بە چەکێکە. میۆ پێویستی بە شمشێرێکە.
پیرە وەڵامی نەدایەوە. بەرەو پەنجەرەکە رۆیشت و کردیەوە. لە زەریاچەکەوە دەنگی قیڕە و قیژەی خەمناکی باڵندەکان دەهات. وەکو ئەوە وا بوو، بەو شەوە تاریکە، لەو دەرە بگرین.
پیرە پێی وتم: گوێ بگرە، گوێ بگرە چۆن سکاڵا دەکەن؟ دەتەوێ تۆش ببیتە یەکێک لەوانەی بەسەر زەریاچەکەدا دەفڕن و سکاڵا دەکەن؟
پرسیم: ئەوانە چ جۆرە باڵندەیەکن؟
پیرە چپاندی: باڵندە سیحرلێکراوەکانن. تۆ چاک دەزانی، کێ سیحری لێ کردوون. چاک دەزانی، کێ فڕاندوونی. ئێستاش دەزانی، ئەوەی بە گژ چەتەدا بچێ، چی بەسەر دێ.
کاتێک کە گوێم لە قسەکانی بوو، تەواو دڵتەنگ بووم. ئەو باڵندانە: براکانی نوونوو، خوشکەکەی یری و کچە بچکۆلەی ژنە جۆڵاکە و هەموو ئەو ئەوانەی تر بوون، کە سوارەکاتۆ فڕاندبوونی و سیحری

لێ کردبوون. نای، منیش دەمویست لە دژی سوارەکاتۆ بە شەڕ بێم، منیش دەمویست!
یوم-یوم وتی: میۆ پێویستی بە شمشێرێکە، بێ شمشێر شەڕ ناکرێ.
- تۆ وتت کەسانێک هەن شمشێر دروست دەکەن، من بیری پیرەم خستەوە.
ئەو وتی: تۆ لە ژیانی لاویت ناترسی.
لێم پرسییەوە: ئەوانەی چەک دروست دەکەن لە کوێن؟
بێ دەنگ بە، پیرەمێردە وتی و بەپەلە پەنجەرەکەی داخست. بێ دەنگ بە، لەوانەیە جاسووسەکان گوێیان لێت بێ.
بە پێدزکە چووە لای دەرگاکەوە و سەری پێوە نا و گوێی هەڵخست.
وتی: کەسی لێ نییە، بەڵام لەوەیە لەوێش بن، جاسووسەکان لە هەموو شوێنێکن
دوایی سەری نایە لای پەناگوێمەوە و چپاندی:
- بچۆ بۆ لای شمشێرسازەکە و سڵاوی ئێنۆی پێ بگەیەنە. پێی بڵێ، کە پێویستت بە شمشێرێکە، شمشێرێک کە بەرد لەت بکا.
پێی بڵێ، کە تۆ سوارێکی لە وڵاتی دوورەوە هاتووی.
بۆ ماوەیەکیش پێیدا ڕوانیم و وتی: پێم وایە، تۆ سوارێکی لە سوارەکانی وڵاتی دوور، ئەو وتی. وا نییە؟
- با، یوم-یوم لەباتی من وەڵامی دایەوە. ئەو هەم سوار و هەم میرە. میر میۆی وڵاتی دوور و پێویستی بە شمشێرێک هەیە.
لێم پرسی: شمشێرسازەکە لە کوێ دەدۆزمەوە؟

پیرەمێردەکە وتی: لە قووڵترین چاڵی ڕەشترین چیادا. بەناو دارستانە مردووەکەدا بڕۆ! هەر ئێستا بڕۆ!

بەرەو لای پەنجەرەکە ڕۆیشت و کردیەوە. لەو دەرە لە زەریاچەکەوە، جارێکی دیش، دەنگی قاوقیژی باڵندەکانم هاتەوە بەر گوێ.

پیرە وتی: بڕۆ، میرمیۆ، من لێرە دەمێنمەوە و هیوامە ساغ و سەلامەت بیت. بەڵام دوور نییە هەر سبەی شەو دەنگی باڵندەیەکی تازەم بێتە بەر گوێ، کە بەسەر زەریاچەکەدا بفڕێ و سکاڵا بکات.

# له دارستانه مردووه‌که‌دا

هەر کە ئێمە دەرگاکەی ئێنۆمان، لە پشت خۆمانەوە، داخست، گوێم لە حیلە و هاواری میرامیس بوو. بە دەنگێکی وا دەیحیلاند و وا بێتاقەت بوو، وەک ئەوە وابوو هاوار بکات: میق، وەرە بە فریادمەوە!

ئەوەندە ترسام هێندەی نەمابوو دڵم ڕابوەستێ.

- یوم-یوم ئەوە چی لە میرامیس دەکەن، هاوارم کرد: گوێت لێیە؛ چی لە میرامیس دەکەن؟

یوم-یوم وتی: بێ دەنگ بە، گرتوویانە... سیخوڕەکان گرتوویانە...

- سیخوڕەکان میرامیسیان گرتووە، قیژاندم و هیچ گوێشم نەدایە ئەوەی کەسێک لەوەیە گوێی لێ بێ.

یوم-یوم چپاندی: بێ دەنگ بە، ئەگینا ئێمەش دەگرن.

بەڵام من گوێم بە قسەکەی ئەو نەدا. میرامیس، ئەسپەکەی خۆم! ئەوە ئەسپەکەی من بوو، گرتبوویان و دەیانویست لێمی زەوت بکەن! ئەو ئەسپەی کە جوانترین و میهرەبانترین ئەسپی دنیا بوو.

گوێم لێ بوو دیسانەوە حیلاندی، وام بە بیردا هات کە کتومت هاوار دەکا: میق، ناتوانی بە هانامەوە بێیت و یارمەتیم بدەی!

یوم-یوم وتی: وەرە، پێویستە بزانین چی لێ دەکەن.

بەو تاریکییە بەسەر تاوێرەکاندا هەڵزناین. چنگەکرێ و



سکەخشەمان بوو. نووکی تیژی تاوێرەکان پەنجەکانمیان بریندار کرد، بەڵام وا لە مەراق و بیری میرامیسدا بووم هەستم بە هیچ نەدەکرد.

ئەو بە بەرزیی تاشەبەردێکەوە لەو تاریکییەدا وەستابوو، سپی سپی دەکردەوە. میرامیسەکەم، سپیترین و جوانترین ئەسپی دنیا.

زۆر ترسناک دەیحیلاند و هەستابووە سەر پاشوو، دەیویست خۆی دەرباز بکا. بەڵام پێنج سیخوڕی ڕەشپۆش بە دەوریدا ئەڵقەیان بەستبوو، دووانیان توند لغاوەکەیان گرتبوو.

میرامیسی بەستەزمان وەها دەترسا، ئەم ترسەشی هیچ سەیر نەبوو، چونکە ئەو سیخوڕە ڕەشپۆشانە زۆر ناهەموار و ئێسکتاڵ بوون و بە دەنگێکی گڕ و ناهەمواریش لەگەڵ یەک دەدوان. من و یوم-یوم، ئەوەندەی زاتمانکرد بە سکەخشە لێیان نزیک کەوتینەوە، لە پشتی تاوێرێکەوە خۆمان مت کرد و گوێمان لێ بوو، سیخوڕەکان، چییان دەوت.

یەکێکیان وتی: چاکترین شت ئەوەیە، بیخەینە کەشتییە ڕەشەکەوە و ڕێک بەسەر زەریاچەی مردندا بەڕێکەوین.

یەکێکی دییان وتی: ئا، بەسەر زەریاچەی مردندا یەکسەر بۆ لای سوارەکاتۆ.

ویستم هاواریان لێ بکەم، کە دەست لە ئەسپەکەم هەڵگرن، بەڵام ئەمەم نەکرد. ئەگەر سیخوڕەکان من بگرن، کێ دەچێتە شەڕی سوارەکاتۆ؟ ئاخ، بۆ دەبێ هەر **من** لە دژی سوارەکاتۆ بجەنگم؟ لەو کاتەدا کە لە پشتی گابەردەکەوە خۆم مەڵاس دابوو، زۆر پەشیمان بووم و خەم دایگرتم. بۆچی لای بابەشام نەمامەوە، لەوێ کەس ڕایەکی نەدەکەوت، ئەسپەکەم لێ زەوت بکا! گوێم لە دەنگی باڵندە سیحرلێکراوەکان بوو، لەو دەرە بەسەر زەریاچەکەوە، دەیانقیژاند، بەڵام گوێم نەدایە. هەر هیچ بایەخێکم پێ نەدان. بەس من ئەسپە یاڵزێڕینەکەمم دەست کەوتایەتەوە، ئیتر خوای دەکرد ئەوان هەروا بە سیحرلێکراوی دەمانەوە.

یەکێک لە سیخوڕەکان وتی: دەبێ کەسێ ئامدیوی سنوور بووبێ.

دەبێ کەسێ سواری ئەم نۆما سپییە بووبێ و سنووری بڕیبێ.
دوژمن لەناوماندایە.
- باشتر، ئەگەر دوژمن کەوتبێتە ناومانەوە، ئەوا گرتنی ئاسانترە.
بۆ سوارەکاتۆش ئاسانترە بیخاتە ژێر پێلەقە و لەناوی بەرێت.
کە گوێم لێیان بوو، لەرز دایگرتم. من ئەو دوژمنە بووم کە سنوورم بەزاندبوو. من ئەو کەسە بووم کە دەبێ سوارەکاتۆ بیخاتە ژێر پێلەقە و لەناوی بەرێت. زۆرتر پەشیمان بوومەوە لەوەی کە ڕووم کردۆتە ئێرە. ئەوەندە غەریبیی بابەشامم کرد و ویستم بزانم ئاخۆ ئەویش وەها بیری من دەکا و پەرۆشە بۆ حاڵم. خۆزگەم ئەوە بوو ایرە بووایە و یارمەتی بدامایە. خۆزگەم دەخواست بۆ تەنیا ئۆزێکیش بێ بیدوێنم. ئەوساکە پێم دەگوت: من دەزانم، تۆ دەتەوێ لەگەڵ سوارەکاتۆدا بجەنگم، بەڵام پیاوی چاک بە، لێم گەڕێ با دەسبەرداری ئەمە ببم. یارمەتیم بدە کە میرامیس بهێنینەوە و ئەم ناوە بەجێ بهێڵین! تۆ بۆ خۆت دەزانی، من قەت پێشتر ئەسپی مۆمم نەبووە و زۆریشم خۆش دەوێ. ئەوەش دەزانی کە قەت باوکیشم نەبووە. ئەگەر بکەومە دەست سوارەکاتۆش ئیتر قەت لای بۆ نابینمەوە. فریام کەوە با لێرە دەرباز بم! نامەوێ چیتر لێرە بمێنمەوە. دەمەوێ لای تۆ بم. دەمەوێ بە خۆم و میرامیسەوە بچمەوە ماڵەوە بۆ دوورگەی سەوزەمێرگان.
کاتێ لە پشتی گابەردەکەوە پاڵکەوتبووم و ڕێک لەو خەیاڵاتەدا بووم، پێم وابوو کە دەنگی بابەشام لە گوێمدا دەزرنگێتەوە. ئەمە

تەنیا خەیالاتێک بوو هیچی تر، بەلام بە هەر حاڵ، پێم وابوو گوێم لە دەنگیەتی.
ئەو وتی: میۆ، میۆکەی خۆم.
لەمە زیاتری نەوت. بەلام تێگەیشم، کە دەیویست من ئازا بم و لەوێ ڕانەکشێم و وەک منداڵێک، تەنانەت ئەگەر میرامیسیشیان لێ سەندبم، هاوار هاوار و گریانم بێ. ئەی من سوارە نەبووم. من چیتر ئەو میۆیە نەبووم، کە خەریکی خانۆچکە و ماقڵە دروستکردن بوو لە باخی گولاندا و ئەو منداڵە نەبووم کە خەریکی هەڵگەڕان و داگەڕانی گردەکانی دوورگەی سەوزەمێرگان و شمشاڵلێدان بوو. من سوارچاک بووم، سوارچاکێک نەک لە بیچمی سوارەکاتۆ، بەڵکو سوارچاکێکی ڕەسەن. سوارچاکیش دەبێ ئازا و بەجەرگ بێ و نەگری.
چیتر نەگریام، ئەگەرچی چاویشم لێ بوو سیخوڕەکان میرامیسیان بەزۆر دابووە بەر و بەرەو زەریاچەکە دەیانبرد، تا خستیانە ناو کەشتییەکی گەورەی ڕەشەوە. نەگریام، ئەگەرچی میرامیس وەک ئەوەی دابێتیانە بەر قامچی دەیحیلاند و چەپۆکانی بوو. نەگریام، کاتێ سیخوڕەکان دەستیان دایە سەوڵەکان و لە ڕەشەئاوەکەدا گوێم لە دەنگی سەوڵلێدان بوو. تا دەهات دەنگیان کز و کزتر دەهاتە بەر گوێم و دوا حیلە و پرمەی خەمناکی میرامیسیشم گوێ لێ بوو، پێش ئەوەی بەتەواوی ئاوا و ونبن، زۆر دوور لە زەریاچەکەوە دەهات. بەلام من نەگریام. چونکە من سوارچاکێک بووم.

نەگـریام؟ با گـریام و چۆن دەڵێم ئاوام کـرد. ئا... ئا... لە پشـتی گابەردەکەوە خۆم دابوو بە زەویدا و تەوێڵم نابوو بە ئەرزە ڕەقەکەوە و بە شـێـوەیەک دەگـریام، کـە قـەت لە ژیانمدا وا نەگـریابووم. سوارچاکێک دەبێ ڕاستیش بڵێ. لە ڕاستیشدا وابوو، من گریام. بۆ میرامیس گریام. گریام و گریام، کاتێکیش کە چاوە بەوەفاکانی میرامیس دەهاتنە پێش چاوم، زۆرتر دەگریام و بانگ و سەلام لێ بەرز دەبوویەوە. ژنە جۆلاکە وتی، کـە سـەد ئەسـپـە سـپـیـیـەکـان فرمێسکی خوێنیان بۆ جوانووە فڕێندراوەکە هەڵدەڕشت. کێ دەزانێ، ڕەنگە گریانەکـەی منیش فـرمـێـسکی خـوێنین بووبێ بۆ مـیـرامـیس. کێ دەزانێ، چونکە ئەوەندە تاریک بوو چاو چاوی نەدەبینی. میرامیسە یاڵزێڕینەکەم! فڕێندرابوو و منیش پێم وابوو کە هەرگیز بە چاوی خۆم نایبینمەوە.

یوم-یوم دانەوییەوە و دەستی خستە سەر شانم.

ئەو وتی: ئیتر مەگری میۆ، ئێمە پێویستە بچینە لای ئاسنگەرەکە.

ئا پێویستت بە شمشێرەکەتە.

گریانێکی زۆرم پێ مابوو، بەلام پەستـامـە ناخـم و کپم کـردەوە.

دەنسکم کپ کرد و دوایی چووین بۆ ئەوەی بە دوای ئاسنگەرەکەدا بگەڕێین.

بەناو دارسـتـانـە مـردووەکـەدا برۆ، ئێنۆ وای وت. بەلام دارسـتـانـە مردووەکە لە کوێیە؟

دە یوم-یومم وت: پێـویسـتـە پێش ئەوەی شـەو دوایی بێ،

ئاسنگەرەکە بدۆزینەوە. تاریکییەکە لە سیخورەکانمان دەشارێتەوە.
پێویستە هەر ئەمشەو بەناو دارستانە مردووەکەدا بەپەلە بڕۆین.
بە سکەخشە و چنگەکرێ بەسەر تاشەبەردەکاندا گەڕاینەوە بەرەو کوخەکەی ئێنۆ. کوخەکە تاریک و کشومات بوو، کەسیش چیدی تیایدا هاوار و دادی نەبوو. بەو شەوە بەرەو پێشەوە ملمان نا و ڕۆیشتین، ئاخری گەیشتینە دارستانە مردووەکە. ئەمە دارستانێ بوو، با تێیدا هەڵی نەدەکرد، لەرە و خشەی گەڵای درەختانی تێدا نەبوو، چونکە هیچ گەڵایەکی سەوز و بچکۆلە بە درەختەکانەوە



نەبوون، تا لەرە و خشەیان بێ. لەوێ تەنیا بنەداری ڕەش و مردوو هەبوو، کە چڵەکانیشیان وەک خۆیان ڕەق و ناشیرین و وشکهەڵاتوو بوون.
کاتێ بەناو دارەکاندا دەڕۆیشتین، یوم-یوم وتی: ئەوا گەیشتینە دارستانە مردووەکە.
من وتم: هەر بە ڕاستییش گەیشتینە ناوی، بەڵام هەرگیز لەو باوەڕەدا نیم لێی دەربچین.
چونکە دارستانێ بوو لەوە بوو پیاو تێیدا ون ببێ، لەو دارستانانە بوو کە جاروبار مرۆڤ خەونی پێوە دەبینێت، پیاو بەناویدا دەڕوا و هەر دەڕوا و قەتیش ڕێگەی چوونەدەرەوە نادۆزێتەوە.
من و یوم-یوم دەستی یەکترمان گرتبوو، کە بەناو دارستانە مردووەکەدا ڕەت دەبووین، خۆمان وەها بچووک و ڕێلێونبوو هاتە پێش چاو. دارە مردووەکانیش وەها چڕ ئاڵابوونە یەکدی، پیاو بە ماڵ دەیتوانی بەناویاندا بەرەوپێشەوە بڕوا.
یوم-یوم وتی: ئەگەر ئەم دارانەش وەها چڕ نەبوویانەیە، ئەگەر تاریکییەکەش وا ڕەش و نووتەک نەبووایە و ئێمەش هێندە بچووک و تەنیا نەبووینایە!
ئێمە هەر ڕۆیشتین و ڕۆیشتین. جاروبار دەنگ لەدوورەوە دەهاتە بەر بای گوێمان. ئەوە سیخوڕەکان بوون، ئێمە گوێمان لێیان بوو. ئەمۆ ڕاستی کرد کە پێی وتین، سیخوڕەکانی سوارەکاتۆ لە هەموو شوێنێ هەن. سەرتاسەری دارستانە مردووەکە پڕ و سیخناخ بوو

لێیان. کاتێکیش من و یوم-یوم گوێمان لە دەنگیان بوو کە لەدوورەوە دەهات، لە جێی خۆمان سڕ بووین و زاتی هەناسەدانیشمان نەبوو.
ئێمە ڕۆیشتین و ڕۆیشتین.
یوم-یوم وتی: دیارە شەوی دارستانە مردووەکە زۆر درێژە، بەڵام بێگومان ڕێگای ئەشکەوتی ئاسنگەرەکە درێژترە.
یوم-یوم، پێت وایە دەیدۆزینەوە... من سەری قسەم دامەزراند. دوایی بێدەنگ بووم. نەمتوانی تەنیا وشەیەک زیاتر لەوە بڵێم. چونکە یەک ڕیز سیخوڕی ڕەشپۆش لەناو دارەکانەوە بەرەو ڕوومان هاتن. هەر ڕێک ڕووەو لای ئێمە هاتن و من زانیم کە حسابمان ڕۆی و تیاچووین. یوم-یومیش بینیني و لە حەژمەتا توند توند دەستی گرتم. هێشتا ئێمەیان نەدیبوو، بەڵام هەرنا و دەدەن بەسەرماندا و دوایی هەموو شتێ دەچێ بە با. من ئیتر هەرگیز هەلی ئەوەم بۆ هەڵناکەوێت بچم بە گژ سوارەکاتۆدا و هەر سبەی شەویش، ئێنۆ گوێی لە دوو باڵندەی تازە دەبێ کە بەسەر زەریاچەکەدا دەفڕن و دەقیژێنن.
سیخوڕەکان تا دەهات نزیکتر دەبوونەوە، ئێمەش لەوێ وەستابووین، چاوەڕێ بووین و توانای جووڵەمان نەمابوو. بەڵام لەپڕ شتێکی سەیر ڕووی دا. بنەدارێکی پیری ڕەش کە لە نزیکمانەوە بوو خۆی کردەوە. من بینیم کە کلۆرە. پێش ئەوەی بە خۆم بزانم چۆن و چی ڕووی دا، من و یوم-یوم پێکڕا خۆمان



ڕاستییەکەی دارستانی ئەوە بوو تیایدا ون ببی.



ترنجانده کلۆری دارەکەوە، لەوێ دانیشتین، وەک دوو بێچووە مەل، کە واشە بەرەو ڕوویان بێ، دەلەرزین. ئیتر سیخوڕەکان گەیشتبوونە بندەستمان و گوێمان لێیان بوو چییان دەوت:

یەکێکیان وتی: گوێم لە یەکێک بوو لە دارستانە مردووەکەدا قسەی دەکرد، ئەوە کێیە لە دارستانە مردووەکەدا قسە دەکا؟

یەکێکی تر وتی: دوژمن لەناوماندایە، دەبێ دوژمن بێ کە لە دارستانە مردووەکەدا قسە دەکا.

یەکێکی تریان وتی: ئەگەر دوژمن لەناو دارستانە مردووەکەدا بێ، ئەوا هەر زوو دەیگرین. بگەڕێن، بگەڕێن هەموو لایەک بپشکنن!

گوێمان لێ بوو، چۆن گەڕان و نێوان دارەکانیان پشکنی. گوێمان

له تریەی پێ و هەنگاوەکانیان بوو، کە بەئەسپایی و پێدزکە لەنزیکمانەوە دەیاننا، ئێمە لەوێ دانیشتبووین و هەستمان کرد چەند بچووکین و دەترسین. گەڕان... گەڕان بەڵام ئێمەیان نەدۆزییەوە. دەنگیان تا دەهات لەدوورترەوە دەبیسترا، دوایی بێدەنگی ئەو ناوەی داگرت. دارە کلۆرەکە بە فریامان کەوت و ڕزگاری کردین. بۆ دارەکە ڕزگاری کردین، تێنەگەیشتم. ڕەنگە هەموو دارستانە مردووەکە ڕقی لە سوارەکاتۆ بێ و بیەوێ یارمەتی کەسێ بدا کە هاتۆتە شەڕی. ڕەنگە ئەو درەختە مردووەش جارێ لە جاران درەختێکی ساغ و تەڕ و نەونەمام بووبێ، کە گەڵای ورد و سەوزی زۆری بە لەرە و لەرزەی بووبێ، کە با یاریی لەنێو چڵەکانیدا کردبێ. دیارە شەڕ و بەڵای سوارەکاتۆ ئەو درەختانەی وشک و زڕ کردووە. من پێم وانییە، کە دار هیچ کاتێ لە کەسێ خۆش ببێ، کە گەڵا سەوز و وردەکانی کوشتبێ. ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێ، ئەو دارە بیەوێ یارمەتیی کەسێ بدا کە هاتبێ لە دژی سوارەکاتۆ بجەنگێ.

کاتێ کە لە کلۆریی درەختەکە هاتینە دەرەوە، من وتم: سوپاس، درەختە چاکەکە، سوپاس.

بەڵام درەختەکە لەوێ بێدەنگ و مردوو وەستابوو، هیچ وەڵامی نەدایەوە.

ئێمە بەناو دارستانە مردووەکەدا هەر ڕۆیشتین.

مەم-یوم وتی: وا خەریکە شەبەق دەدا و هێشتا ئێمە ئەشکەوتی ئاسنگەرەکەمان نەدۆزیوەتەوە.

ئا، شەو دوایی هات، بەڵام کازیوە وەک ئەوەی لای خۆمان دیار و ڕوون نەبوو. کـــازیوە بۆر و بەربەیانیش هێندە لێڵ بوو هەر لە تاریکی دەچوو. من شەبەقی بەیانیانی لای خۆمانم، لە دوورگەی سەوزەمێرگان، هات بە بیردا، ئەو کاتانەی کە ئێمە بە سواری میرامیس دەڕۆیشتین و گیا نوقمی شەونم بوو، هەر تەڵە گیای بچکۆلە بوو دەبریسکایەوە. ئا لەو کاتەدا دەڕۆیشتم و بیرم لە میرامیس دەکردەوە و ئاگام لە خۆم نەمابوو. بۆیە هیچ سەرسام نەبووم و نەترسام، کە گوێم لە ترپەی سمی ئەسپ بوو کە نزیک دەبوویەوە. بیرم کردەوە: ئەوە میرامیسە دێ. یوم-یوم بەتوندی قۆڵی گرتم و چپاندی بە گوێمدا.

ـ گوێت لێیە! سیخوڕەکان بەسواری بەناو دارستانە مردووەکەدا دەسووڕێنەوە.

ئەوسا زانیم کە کار لە کار ترازاوە. ئێستە ئیتر شتێ نییە ئێمە بپارێزێ. هەرنا و سیخوڕە ڕەشپۆشەکان بەناو دارەکاندا دەگەنە بەرەوە و دەمانبینن. بەسواری وەک ڕەشەبا بەپرتاو دێن و خۆیان دادەنەوێننەوە و دەمانگرن و فڕێمان دەدەنە سەر پشتی ئەسپەکانیان و بەرەو قەڵاکەی سوارەکاتۆمان دەدەنەبەر. منیش هەرگیز ناتوانم لەگەڵی بە شەڕ بێم. هەر سبەی شەویش ئێنۆ گوێی لە داد و بێدادی دوو باڵندەی تازە دەبێ کە بەسەر زەریاچەکەوە دەفڕن.

زانیم کە هەموو شتێ بە فیڕۆ ڕۆی. ترپەی سمی ئەسپەکان تا

دەهات نزیکتر دەبۆوە. بەلاّم ئەوسا، شتێکی سەیر ڕووی دا. لە بەردەمماندا ئەرزەکە قلّیشایەوە و بینیم کونێک لە ئەرزەکەدایە، بێ ئەوەی بە خۆم بزانم چۆن بوو، من و یوم-یوم لە کونەکەدا خۆمان ناڵاندبووە یەک و وەک دوو بەچکە کەروێشک کە ڕێوی بەرەو ڕوویان بێ، دەلەرزین.

ئەمە لە دواچرکەدا بوو. گوێمان لە زرمەی سمی ئەسپەکان بوو نزیکتر دەبۆوە. گوێمان لە سیخوڕەکان بوو بەسەر سەرمانەوە بوون. هەر ڕێک بەسەر کونەکەدا بەسواری ڕەت بوون. گوێمان لە تریەی سمەکان بوو، گوێمان لە سمی قورسی ئەسپەکان بوو کە بەسەر بانی کونەکەوە ناڵەی دەهات. هەندێ وردەگڵ بەربۆوە و کەوت بەسەرماندا. لەوێ دانیشتبووین و هەستمان دەکرد چەند بچووکین و چەندێ دەترسین.

بەلاّم دیسان کڕ و کپ بوویەوە. هێندە کڕ و کپ وەک ئەوەی هیچ سیخوڕێ لە دارستانە مردووکەدا نەبێ. ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ بووین.

لەدواییدا وتم: پێم وایە ئێستا دەتوانین بچینە دەرەوە.

بەلاّم هەر لەگەڵ تەواوبوونی قسەکەمدا و گوێمان لە زرمەی ناقۆلاّی سمی ئەسپەکان بوویەوە. سیخوڕەکان گەڕانەوە. جارێکی دیش سمکۆڵ و چەپۆکانی ئەسپەکان گەیشتنەوە سەرمان و گوێمان لە هاوار و قیژەی سیخوڕەکان بوو. لە ئەسپەکان دابەزین و لە نزیکی کونەکەوە، لەسەر زەوییەکە، دانیشتن. لەو درزەوە کە لە کونەکەدا

بوو، چاومان لێیان بوو. ئەوەندە لێمانەوە نزیک بوون، دەمانتوانی دەستیان بگەیەنینێ. گوێشمان لێ بوو چییان وت.

یەکێکیان وتی: - پەیامی سوارەکاتۆیە دەبێ دوژمن قۆڵبەست بکرێ و بگیرێ. ئەو دوژمنەی کە بە سواری نۆما سپییەکە هاتووە، دەبێ هەر ئەمشەو بگیرێ، ئەمە پەیامی سوارەکاتۆیە.

یەکێکی دی وتی: دوژمن لەناوماندایە، بێگومان دەبێ قۆڵبەستی کەین. بگەڕێن، هەموو کون و قوژبنێک بگەڕێن!

ئەوان لەنزیکمانەوە دانیشتبوون و باسی ئەوەیان دەکرد کە چۆن دەبێ بمانگرن. ڕەشپۆش و ترسناک، لەبەر شەبەقی ئەو بەیانییە لێڵ و تاریکەدا و، لەناو ئەو هەموو درەختە مردووانەدا کە دەوریان دابوون، دانیشتبوون و ئەسپە ڕەشەکانیشیان لەو ناوەدا لە هەڵپەی لەوەڕیندا بوون و سمکۆڵیان دەکرد و چەپۆکانیان بوو بەسەر زەوییەکەدا .

سیخوڕێکیان وتی: بگەڕێن، هەموو کون و قوژبنێک بپشکنن! ئەو کونە چییە لە زەوییەکەدا؟

یەکێکی دی وتی: کونێکە لە ئەرزەکەدا، ڕەنگە دوژمنەکەی لەناودا بێ. بگەڕێن، هەموو شوێنێ بگەڕێن!

یوم-یوم و من بەتوندی باوەشمان بەیەکتردا کردبوو. تێگەیشتم، کە ئیتر کار لە کار ترازاوە.

یەکێک لە سیخوڕەکان وتی: بە ڕمەکەم تاقی دەکەمەوە، ئەگەر دوژمنەکەمان لەوێ بێ، ئەوا دەیکەم بە سەری ڕمەکەمەوە.

بینیمان ڕمێکی ڕەش لە درزەکەوە هاتە ژوورەوە. چەندێ توانیمان ئەوەندە بەرەو ژێر و بنەوە بووینەوە. بەڵام ڕمەکەش درێژ بوو، سەرە تیژەکەی نزیکتر و نزیکتر بوویەوە. چەقی و چەقی، بەڵام بەر ئێمە نەکەوت. بەر دیواری کونەکە کەوت کە کەوتبووە نێوان من و یوم-یومەوە و بەر ئێمە نەکەوت.

ـ بگەڕێن، کون و قوژبنی دارستانە مردووەکە بگەڕێن.

سیخوڕەکان لە جێی خۆیانەوە وتیان. پەیامی سوارەکاتۆیە، دەبێ دوژمن بگیرێ. بەڵام ئەو لێرە نییە. بگەڕێن هەموو شوێنێ بگەڕێن!

سیخوڕەکان خۆیان هەڵدایە سەر پشتی ئەسپە ڕەشەکانیان و غاریان دا.

نەجاتمان بوو. کونەکە ئێمەی ڕزگار کرد و، منیش بە خۆمم دەوت لەبەرچی. بلێی لەبەر ئەوە بێ کە تەنانەت خاک و خۆڵی ئەو ناوەش ڕقیان لە سوارەکاتۆ بێ و بە دڵ بیانەوێ یارمەتی ئەو کەسە بدەن کە دەچێتە شەڕی سوارەکاتۆ؟ ڕەنگە ڕۆژگارێ گژوگیایەکی نەرم و سەوز لەو خاک و خۆڵەدا ڕوابێ. گیایەک کە بەربەیانیان بە ئاونگ تەڕ بوویێ. بێگومان ئەوە نەگریسی و بەدکاری سوارەکاتۆیە کە گژوگیای ئەو ناوەی وشک کردووە و لەناوی بردووە. من پێم وانییە، کە زەوییەک لە کەسێک خۆش ببێ، کە گژوگیای نەرم و سەوزی سەر ئەوی کوشتبێ، کە سەروەختێ لەوێ ڕووابێ. هەر لەبەر ئەوەشە ئەو کەسەی پاراست کە هاتووە و دەیەوێ لەگەڵ سوارەکاتۆدا بجەنگێ.

کاتێک کە ڕۆیشتین، وتم: سوپاس، ئەی خاک و خۆڵی میهرەبان، سوپاس. بەڵام زەوییەکە وەڵامی نەبوو. لە جێی خۆیدا بە بێدەنگی ڕاکشابوو و کونەکەش لە جێی خۆی نەمابوو.

ئێمە ڕۆیشتین و ڕۆیشتین، تا گەیشتینە سەری ئەوسەری دارستانە مردووەکە. شاخ و تاوێر لە بەردەمماندا قووت بوونەوە. ئیتر تەواو بێ هیوا بووم. ئەوانە ڕکەشاخ و تاوێرەکانی دەوری زەریاچە مردووەکە بوون کە ئێمە بۆیان گەڕابووینەوە. هەردووکمان، من و یوم-یوم، تەواو بێ هیوا بووین. هیچ بەسەر هیچەوە نەما. ئێمە هەرگیز ئاسنگەرەکە نادۆزینەوە. یەک شەوی ڕێک بە دارستانە مردووەکەدا ڕێمان کرد و ئێستاش ڕاست و ڕەوان گەیشتووینەتەوە ئەو شوێنەی لێوەی دەستمان پێکرد. کوخەکەی ئێنۆ لەو ناوەدا ئەوەندە بچووک و بۆر و بێنموود دەینواند. خۆی دابووە پاڵ زنارەکە بۆ ئەوەی دانەڕمێ. ئەوە زنارێکی بەرزی ڕەشی قەترانی بوو کە کوخەکە خۆی لەپاڵدا ڕاگرتبوو.

یوم-یوم وتی: دیارە ئەمە ڕەشترین چیای دنیایە.

ـ ڕەشترین چیای دنیا ـ ئا، دە کەواتە کونی ئاسنگەرەکە لێرەدایە! قووڵترین کون لە ڕەشترین چیادا، ئێنۆ ئاوای پێ وتین.

سەری قسەم دامەزراند: ئای، یوم-یوم، دەی با بزانین...

بەڵام ئیتر بێدەنگ بووم و زانیم کە ئیتر کار لە کار ترازاوە. چونکە لە دارستانە مردووەکەوە قەتارەیەکی درێژ لە سیخوڕە ڕەشپۆشەکان بە شالاو بەرەو ڕوومان دەهات. هەندێکیان بە



ڕاکردن، هەندێکیان بە سواری ئەسپە ڕەشەکانیان، هەمووشیان ڕێک بەرەو ئێمە دەهاتن. ئەوان ئێمەیان بینی بوو، بە دەنگە گڕەکانیان هاواریان دەکرد و بە بەرزی دەیانقیژاند:

ـ دوژمن لەناوماندایە. ئەوەتا لەوێیە. بیگرن! بیگرن! پەیامی سوارەکاتۆیە کە دەبێ دوژمن قۆڵبەست بکرێ و بگیرێ.

من و یوم–یوم لەوێ وەستابووین، پشتمان نابوو بە قەدپاڵی چیاکەوە و دەمانبینی سیخوڕەکان تا دەهات لە ئێمە نزیکتر

دەبوونەوە. ئا، کار لە کار ترازا و منیش قەت ناتوانم لە دژی سوارەکاتۆ بجەنگم. ئەوەندە دڵم تەنگ بوو، هەر مەپرسە. ویستم خۆم بدەم بە زەوییەکەدا و بگریم. هەر لە سبەی شەو درەنگتر نییە ئێنۆ گوێی لە باڵندەیەک دەبێ کە بەسەر زەریاچەکەدا دەفڕێ، باڵندەیەک کە لە هەموویان بەرزتر و خەمناکتر داد و بێداد دەکا. ئێنۆش لەبەر پەنجەرەکەیدا دەوەستێ و لەبەرخۆیەوە دەڵێ:

ـ ئەوە میرمیۆیە لەو دەرە دەفڕێ.

# قووڵترین ئەشکەوت لە ڕەشترین چیادا

بەلاّم شتێکی سەیر ڕووی دا. ئەو قەدپاڵەی ئێمە پاڵمان پێوەدابوو، کرایەوە و پێش ئەوەی بزانم چی ڕووی دا، من و یوم-یوم لەناو چیاکەدا وەستابووین و، وەک دوو بەرخۆلە کاتێ گورگ بەرەو ڕوویان بێ، لەرز گرتبووینی.

هیچ پێویست نەبوو ئەوەندە بترسین. ئێمە لەناو چیاکەدا بووین و سیخوڕەکانیش لەودیوەوە، دەروازەی قەدپاڵەکەش هاتبووەوە یەک. لێرە قەت نەیاندەتوانی زەفەرمان پێ بەرن. بەلاّم گوێمان لێ بوو چۆن لەودیوەوە شێتگیر بووبوون و شالاّویان دەهێنا.

- بگەڕێن، هەموو کون و قوژبنێک بگەڕێن. دوژمن لەناوماندا بوو، بەلاّم ئێستە ونە. هەموو شوێنێ بگەڕێن!

من وتم: ئا، ئا بگەڕێن، بەلاّم هەرگیز لێرە ناماندۆزنەوە.

من و یوم-یوم ئەوەندە دڵخۆش بووین، پڕ بە دڵ لەناو چیاکەدا قاقامان لێدەدا. بەلاّم هەر کە میرامیسم هات بە خەیاڵدا ئیتر چیدی پێ نەکەنیم.

دوایی سەیری دەوروبەری خۆمان کرد. لە ئەشکەوتێکی گەورەدا بووین. تاریک بوو، بەلاّم زۆر نا. ڕۆشناییەکی کزی لێ بوو، مرۆڤ نەیدەزانی لەکوێوە دێ. لە ئەشکەوتەکەوە چەند ڕێگایەکی تاریک بەرەو ناوەوەی چیاکە دەبوونەوە.

له قووڵترین ئەشکەوتی ڕەشترین چیادا ئاسنگەرەکە دەژی، ئێنز وای پێ وتبووین. ڕەنگە یەکێ لەو ڕاڕەوە تاریکانە بەرەو لای ئاسنگەرەکە بڕوا، بەڵام کامیان؟

ئێمە ئەمەمان نەدەزانی. دەبووایە ڕێگەیەکی دووروودرێژ ببڕین پێش ئەوەی بیدۆزینەوە.

یوم-یوم وتی: ئا، بە هەر حاڵ، ئێستە ئێمە هاتووینەتە ناو ڕەشترین چیاوە.

من وتم: ڕاست دەکەی هاتووین، بەڵام باوەڕم نییە هەرگیز سەری لێ بەرینە دەرەوە.

ڕاستییەکەشی لەو چیایانە بوو مرۆڤی تێدا وێڵ ببێ، چیایەک کە جاروبار پیاو خەونی پێوە دەبینێ. پیاو هەر دەڕوا و دەڕوا، پێچە تاریکەکانی دەبڕێ و ناتوانێ لێی قوتاربێ و بچێتە دەرەوە.

من و یوم-یوم دەستی یەکمان گرت و، بەناو چیاکەدا ڕۆیشتین، خۆمان هێندە بچووک و ڕێوێڵکردوو دەهاتە پێش چاو، ئەو ڕێگایەش کە بۆ ئەشکەوتە قووڵەکە دەڕۆیشت، بڕانەوەی نەبوو.

یوم-یوم وتی: ئەگەر ئەم چیایەش وا وەحشەتناک نەبووایە، ئەگەر کۆڵان و پێچەکانیشی وا تاریک و نووتەک نەبوونایە و ئێمەش هێندە بچووک و تەنیا نەبووینایە.

ڕۆیشتین و ڕۆیشتین. ڕێگاکان لێک جیادەبوونەوە. بە گشت لایەکدا لقیان لێ دەبوویەوە. تۆڕێکی تەواو لە ڕێچکەی تاریک لەناو ئەو چیایەدا بوو. جاروبار ئەو کەمە ڕۆشنایییە نەختێک بەهێزتر دەبوو،

پیـاو دەیتـوانی یەک دوو مـەترێک بەر پێی خـۆی ببـینێ، بەڵام جـارجـاریش هێندە تاریک بوو چاو چاوی نەدەبینی. هەندێ جـار کۆلانەکە ئەوەندە نەوی بوو، کە پیاو نەیدەتوانی بەرزەبالا پێیدا بڕوا و ناچاربوو خۆی بچەمێنێتەوە، جاروباریش بنمیچەکەی هێندەی بنمیچی کەنیسەیەک بەرز بوو. قەدپاڵەکان بە ئاو تەڕ بووبوون، سـارد بوو و، ئێـمـەش بۆ ئەوەی لەسـەرماندا نەتەزین لەرەنجییەکانمان لە خۆمانەوە پێچابوو.

یوم-یوم وتی: ڕەنگە قەت نە ڕێگای چوونەدەرەوە و نە ئاسنگەرەکە نەدۆزینەوە.

برسیمان بوو و، تۆزێ لەو نانەمان خـوارد کە سکی برسی تێر دەکا. هەر تۆزێکمان خوارد، چونکە نەماندەزانی تا چەندێ دەبێ بەشمان بکا.

بەدەم ڕێوە دەمانخوارد. هەر کە نانەکە لە قورگم چووە خوارەوە، گەیشتینە شوێنێ، لەوێدا ڕێگاکە دەبوو بە سێڕێیانێک.

ئاو بە قەدپاڵەکەدا دەهاتە خوارێ و، منیش تینووم بوو. وەستام و لە ئاوەکەم خـواردەوە. ئاوێکی زۆر خـۆش نەبوو، بەڵام ناچاری بوو لەوە زیاتری لێ نەبوو. دوای ئاوخـواردنەوەکە لام کـردەوە بە لای یوم-یومدا. بەڵام یوم-یوم لەوێ نەمـابوو. دیار نەبوو. ڕەنگە ئەو ئاگای لەوە نەبووبێ کە من بۆ ئاوخواردنەوە وەستابووم و وایزابینێ هەر بەدوایەوەم و هەروا ملی یەکێک لە ڕێگاکانی گرتبێ.

لەپێشدا هیچ نەترسام. لای سێڕێیانەکەدا وەستام و ویستم بزانم



یوم-یوم ملی کام ڕێگایانی گرتووە. ڕێی تێ نەدەچوو هێندە دوور کەوتبێتەوە، منیش دەمتوانی هاواری لێ بکەم.

تا هێزم تیا بوو هاوارم کرد: -یوم-یوم لە کوێی. بەڵام هاوارەکەم وەک چپەیەک بەئاستەم دەبیسترا. نازانم، ئەمە چ جۆرە چیایەکی سەیر بوو، تاشەبەردەکان دەنگی هاوارەکەی منیان کپ کرد و وەک چپەچپ هاتە بەر گوێ و چپەچپەکەیش لەناو چیاکەدا ئاوازەی دەدایەوە.

ـ یوم-یوم لە کوێی، لە پێچە تاریکەکاندا چپەی دەهات، یوم-یوم لە کوێی... یوم-یوم لە کوێی؟

ئەوساکە زۆر ترسام! هەوڵمدا بەرزتر بقیژێنم، بەڵام لە چیاکەدا هەر وەک چپەچپ دەهاتە بەر گوێ. نەمتوانی باوەڕ بکەم، کە ئەوە دەنگی خۆمە کە بەر گوێم دەکەوت، بەڵکو هی یەکێکی ترە. یەکێک کە دوور لە من و لە شوێنێکی تری ناو چیاکەدا دانیشتبوو و گاڵتەی پێ دەکردم.

ـ یوم–یوم لەکوێی... یوم–یوم لەکوێی... یوم–یوم لەکوێی، وەک چپەیەک بەر گوێ دەکەوت.

ئای کە ترسام! بەپەلە خۆم کرد بە کۆڵانەکەی لای چەپدا و یەک دوو قەڵەمبازم دا، بە یەک دوو قەڵەمبازیش بەرەو سێرێیانەکە گەڕامەوە و خۆم کرد بە کۆڵانەکەی دەستی ڕاستدا، بەڵام دیسانەوە گەڕامەوە و ڕێگای ناوەڕاستم گرتە بەر. یوم–یوم، تۆ ملی کام ڕێگات گرتووە؟ زاتم نەکرد لەوە زیاتر هاوار بکەم، چونکە چپەچپەکە لە هەموو شتێکی تر ناخۆشتر بوو. بەڵام پێم وابوو کە یوم–یوم دەبوو بزانێ کە من چەند غەریبیم دەکرد و لە هۆڵی ئەوەدا بووم کە بگەڕێتەوە بۆ لام.

ڕێگاکە دیسانەوە چەند لقێکی لێ دەبووەوە، بە هەموو لایەکدا، ڕێگای تازە و تاریکی لێ دەبوویەوە و منیش لەو ناوەدا ڕامدەکرد و ئەملاولا دەگەڕام. هەوڵمدا نەگریم، چونکە من سوارە بووم، بەڵام ئا لەو کاتەدا توانای ئەوەم نەبوو چیتر سوارەیەک بم. بیرم لە یوم–یوم کردەوە، کە بە لایەکی تردا ڕایدەکرد و ڕێگایەکی تری گرتبووە بەر و خەمبار بوو و هاواری لە من دەکرد، ئەوسا خۆم دا بەسەر ئەو

زناره ڕەق و تەقانەدا و تێر تێر گریام، بەقەد ئەوجارەی کە سیخوڕەکان میرامیسیان برد. ئیتر من نە میرامیس و نە یوم-یومم بوو. هەر بە یەکجاری تەنیا بووم. لەوێ لێی کەوتبووم و دەگریام و پەشیمان بووم لەوەی کە هاتبوومە ئێرە، تێشنەدەگەیشتم کە چۆن بابەشام ویستبووی من ئەو ڕێگایە بگرمە بەر و بچمە شەڕی سوارەکاتۆ. حەزم دەکرد بابەشام لەوێ بووایە و پێم بووتایە:
- دەبینی چەند تەنیا ماومەتەوە. یوم-یوم دیار نەماوە و، خۆشت دەزانی دوای ئەوەی لە بێنکا براوم، ئەو باشترین هاوڕێمە و ئێستە یوم-یومیشم لەدەستچوو. من هەر بە یەکجاری تەنیا کەوتوومەتەوە، ئەوەش هەر لەبەر ئەوەی تۆ دەتەوێ لە گەڵ سوارەکاتۆدا بجەنگم.





پێم وابوو یەکەمجارە هەست بکەم بابەشام زۆر لەسەر هەق نەبێ، کە ویستویەتی من ئەم ڕێگا پڕ لە مەترسییە بگرمە بەر. بەڵام کاتێ لەوێ ڕاکشابووم و دەگریام ئاوا بیرم دەکردەوە، کتومت وەک ئەوە وابوو کە دەنگی بابەشام ببیستم. دەزانم کە ئەمە تەنیا خەیاڵاتێک بوو هیچی تر، بەڵام پێشم وابوو کە بە ڕاستی گوێم لێی بوو دەیوت:

ـ میۆ، میۆکەی من.

هەر ئەوەندە و هیچی تر. بەڵام وا هاتە بەر گوێم کە مەبەستی ئەوە بێت، کە پێویست ناکات من ئاوا نیگەران بم. منیش بیرم کردەوە، کە هەر چۆنێک بێ ڕەنگە یوم-یوم بدۆزمەوە.

لە جێی خۆم ڕاست بوومەوە، لەو کاتەدا شتێ لە گیرفانم کەوتە خوارەوە. ئەوە، ئەو شمشاڵە دارینە بوو کە نوونووو بۆ منی تاشیبوو. شمشاڵە دارینەکەم ئەوەی کە لە بارگە و بنەکەی دوورگەی سەوزەمێرگان لەگەڵ ئەوانی تردا لێم دەدا.

بیرم کردەوە، ئەگەر بە شمشاڵەکەم ئاوازێک بژەنم. ئەو ئاوازە کۆنەی کە نوونووو فێری کردبووین. ئەوەم هاتەوە یاد کە من و یوم-یوم چیمان بە یەکتر وتبوو: ئەگەر جارێ لە جاران لە یەک ونبووین دەبێ ئەو ئاوازە کۆنە لێ بدەین.

شمشاڵەکەم نا بە لێومەوە. بەڵام بە هەزار حاڵ وێرام فووی پیا بکەم. ئەوەندە دەترسام لەوەی، کە دیسانەوە دەنگێکی مردووی ناخۆشی لێ بێت، وەکو دەنگی قیژە و هاوارەکانم. بەڵام بیرم

کردەوە هەرچی شتێ بێ، دەبێ هەر هەوڵێک بدەم و دەستم کرد بە ژەندنی ئاوازەکە.

ئای، چ ئاوازێکی ڕەوان بوو! ئەوەندە ساف و ڕوون و دڵگیر بوو، لەوێ لەناو ئەو چیا تاریکەدا، تەنانەت لەوەی دوورگەی سەوزەمێرگانیش خۆشتر دەهاتە بەر گوێ.

هەموو ئاوازەکەم لێدا و دوایی گوێم گرت. لە جێیەکی دوور دوورەوە دەنگی ئاوازێک وەک وەڵامدانەوەی من هاتە بەر گوێم. زۆر بە نزمی، بەڵام زانیم کە ئەوە یوم-یوم بوو وەڵامی دامەوە. هەرگیز ئەوەندە دڵم خۆش نەبووە.

لەسەر شمشاڵلێدان بەردەوام بووم، هەر چەندە زۆر دڵشاد بووم بەڵام نەشمدەتوانی لە خۆشیا نەگریم، بەم بەزمەوە بەناو چیاکەدا دەڕۆیشتم و شمشاڵم دەژەند و تۆزە تۆزەش دەگریام. تەنیا تۆزێ گریام، لەکاتێکدا بە ڕێگەوە دەمژەند و شوێن ئاوازی شمشاڵەکەی یوم-یوم کەوتبووم. جاروبار دەنگەکە لە نزیکەوە دەهات و، منیش هەوڵم دەدا بەرەو ئەو لایە بڕۆم کە دەنگەکەی لێوە دەهات. تا دەهات نزیکتر و نزیکتر دەبووەوە. تا دەهات ڕوونتر و بەرزتر گوێم لەو ئاوازە کۆنە دەبوو کە لە شمشاڵێکی ترەوە، نەک لەوەی خۆمەوە، دەهات. هەر هێندەم زانی و لەپڕێکا لە کۆڵانە تاریکەکەدا یوم-یوم لە بەردەمما قوت بووەوە. هاوڕێی بەوەفا و دڵسۆزم یوم-یوم! دەستم بۆ درێژ کرد و دەستێکم تێوە دا. دەستم خستە سەر شانی. دەمویست بزانم کە هەر بە ڕاستی یوم-یوم خۆیەتی.

هەرواش وابوو. هاوڕێ دڵسۆزەکەی خۆم بوو لەبەردەممدا ڕاوەستابوو.

یوم-یوم وتی: ئەگەر بێت و جارێکی تر نوونوو ببینمەوە، پڕ بە دڵ سوپاسی دەکەم بۆ ئەوەی ئەو شمشاڵانەی بۆ دروست کردین.

- منیش هەروەها.

بەڵام دوایی هات بە بیرما کە ئێمە هەرگیز جارێکی دی نوونوو نابینینەوە.

لە یوم-یومم پرسی: یوم-یوم ئێستە بە کام ڕێگادا بڕۆین؟

یوم-یوم وتی: گرنگ نییە بە کام ڕێگایاندا دەڕۆین، گرنگ ئەوەیە پێکەوە بین و لە یەکتر جیا نەبینەوە.

منیش هەر بیرم لای ئەوە بوو. ڕۆیشتین و ڕۆیشتین، هەستیشمان دەکرد کە چیتر هێندە بچکۆلە و ڕێلێونبوو نین. چونکە بەیەکەوە بووین و شمشاڵمان لێ دەدا. ئەو ئاوازە کۆنە ئەوەندە ڕوون و شیرین بوو، هێندە دڵگیر لە چیا ڕەشەکەدا دەنگی دەدایەوە، وەک ئەوە وابوو کە دڵمان باتەوە و یارمەتیمان بدات کە ئازا بین.

ڕێگاکە بەرەو خوار دەبووەوە. بەرەو خوار و خوارتر. ئەو ڕووناکییە تازەی کە ناو چیاکەی بۆ ڕۆشن دەکردینەوە، تۆزێ بەهێزتر بوو. دیاربوو کە ئەوە تیشکی ئاگر بوو. گڕی ئاگرێ بوو کە ناو چیا تاریکەکەی ڕوون دەکردەوە، چونکە پرتەپرتی بوو، هەندێ جار کز دەبوو، هەندێ جاریش زیاددەبوو.

تا دەهات لە ئاگرەکە نزیکتر دەبووینەوە، لە کاتێکدا کە بەدەم

ڕێگاوە شمشاڵەکانمان لێدەدا. کاتێکیش پێمان نایە ناو ئەو ئەشکەوتەوە کە ئاسنگەرەکە کاری تێدا دەکرد، هەر ئاوازە کۆنەکەمان دەژەند.

ئێمە ئەو کاتە گەیشتبووینە ئاسنگەرخانەکە. لەوێ ئاگرێکی بەتین دەسووتا. دەزگایەکی گەورەشی لێ بوو، لەپاڵ دەزگاکەشدا پیاوێک وەستابوو. ئەوە بەخۆوەترین و تێکسمڕاوترین پیاوێک بوو کە من تا ئەو کاتە دیتبێتم. قژێکی پڕ و سووری هەبوو، ڕیشیشی هەر سوور بوو. هەموو گیانی دووکەڵ ڕەشی کردبوو، دەست و مەچەکی ئەوەندە ڕەشبوون کە من تا ئەو کاتە قەت دەست و مەچەکی وا ڕەشم نەدیبوو. برۆکانیشی زۆر ئەستوور و پڕ بوون، کاتێ کە چووینە ژوورەوە لە جێی خۆی ڕاوەستا و، برۆ ئەستوورەکانی لە جێی خۆیان بەرز بوونەوە و، بە سەرسووڕمانەوە چاوی تێ بڕین، سەیری کردین و وتی:

- ئەوە کێیە لە چیاکەی مندا شمشاڵ دەژەنێ؟ کێیە ئەوەی لە چیاکەی مندا شمشاڵ لێ دەدا؟

یوم-یوم وتی: سوارچاکێک بە خۆی و هاوڕێکاکەیەوە سوارچاکێکی خەڵکی وڵاتی دوور. ئەوە میر میۆیە لە چیاکەی تۆدا شمشاڵ دەژەنێ.

ئەوسا ئاسنگەرەکە هاتە پێشەوە لێم. پەنجەی شایەتمانی کە بە دووکەڵ ڕەش ڕەش بووبوو، هێنا بە تەوێڵمدا و تەواو سەری سووڕمابوو.



ئاسنگەرەکە وتی: ئەوە کێیە لە چیاکەی مندا شمشاڵ دەژەنێ!

وتی: ناوچەوانت چەند ڕۆشنە، نیگات چەند گەشە و چەند خۆش لە چیاکەی مندا شمشاڵ دەژەنی!
من وتم: هاتووم بۆ ئەوەی داوای شمشێریکت لێ بکەم، ئێنۆ ناردوومی.
ئاسنگەرەکە وتی: شمشێرت بۆ چییە.
وتم: دەمەوێ بچمە شەڕی سوارەکاتۆ.
هەر ئەمەم لە دەم دەرچوو، ئاسنگەری تاین، نەڕەیەکی هێندە ترسناکی لێوە هات، کە هەرگیز لە کەسم نەبیستبوو.
بە شێوەیەک قیژاندی کە هەموو چیاکە دەنگی دایەوە. - سوارەکاتۆ! با بمرێ سوارەکاتۆ!
جۆرە گرمەیەک بوو لە هەورەتریشقە دەچوو، لە پێچ و کۆلانە تاریکەکانی چیاکەدا ناڵەی دەهات و دەنگی دەدایەوە. کاتێک ئاسنگەرەکە هاواری کرد، هاوارەکەی وەک ئەوەی من نەبووە نووزە، نا، هاوارەکەی ئەو لە هەورەگرمە دەچوو، ناڵەی دەهات و لەنێوان زنار و قەدی چیاکەدا دەنگی دەدایەوە.
ئاسنگەرەکە لە جێی خۆی وەستابوو، دەستە قەبە و ڕەشەکانی نووقاندبوو و، پریشکی ئاگرەکەش دەیدا لە ڕووخساری کە لە ڕقاندا ڕەش داگەڕابوو.
دەیقیژاند و دەیقیژاند: با بمرێ سوارەکاتۆ.
پریشکی ئاگرەکە دەشیدا لە ڕیزە شمشێرێکی تیژ کە بە دیواری ماڵەکەیەوە هەڵواسرابوون. بریسک و هووڕیان بوو، ترسیان

دەخستە دڵەوە. وەستام تا سەیریان بکەم، ئەوسا ئاسنگەرەکە وازی لە هاوار و نەڕەنەڕ هێنا و هاتە پێشەوە بۆ لای من.
وتی: شمشێرەکانم دەبینی. شمشێرە تیژەکانم دەبینی. ئەمانەم هەموو بۆ سوارەکاتۆ دروست کردووە. بۆ خۆشم ئاسنگەری سوارەکاتۆم.
پرسیم: ئەگەر ئاسنگەری ئەوی، ئەی بۆچی هاوار دەکەی "با بمرێ سوارەکاتۆ"؟
بە شێوەیەک مستی خۆی گوشی ئێسکەکانی سەر دەستی سپی هەڵگەڕان.
وتی: چونکە کەس نییە بەقەد ئاسنگەرەکەی سوارەکاتۆ ڕقی لە سوارەکاتۆ ببێتەوە.
تا ئەو کاتەش ئەو کۆت و زنجیرە پۆلاییەنەم نەدیبوو، کە سەرێکی بە قاچیەوە بەسترابوو و، سەرەکەی تریشی بە قەد تاشی چیاکەوە بەسترابوو، کاتێ بەناوماڵەکەیدا دەڕۆیشت، زرم و هوڕی ئەو ناوەی پڕ دەکرد.
لێم پرسی: - بۆچی بە قەد چیاکەوە کۆتکراوی، بۆ کۆت و زنجیرەکەت ناخەیتە سەر ئاگرەکە و داخی ناکەیت، تا دوایی بتوانیت لەسەر دەزگاکەت بە چەکوش پارچە پارچەی بکەی؟
ئاسنگەرەکە وتی: سوارەکاتۆ لێرە منی کۆت و زنجیر کردووە. هیچ ئاگرێکیش کار لە زنجیرەکانی سوارەکاتۆ ناکات و هیچ پیکێکش کار لە زنجیرەکانی ئەو ناکا و نایشکێنێ. ڕقەزنجیرەکانی سوارەکاتۆ هەروا بەئاسانی ناپسێن.

لێم پرسی: بۆ دەبێ تۆ کۆتی ڕق و قینی ئەوت لە پێدا بێ؟
وتی: چونکە من ئەو کەسەم کە شمشێر دروست دەکەم، ئەو شمشێرە دروست دەکەم کە خەڵکی چاک و بێگوناهانی پێ دەکوژرێ. هەر لەبەر ئەوەشە سوارەکاتۆ بە زامنترین کۆت و زنجیری خۆی منی لێرە بەستۆتەوە. ئەو بێ شمشێرەکانی من کاری مەیسەر نابێ.
ئاسنگەرەکە بە شێوەیەک سەیری دەکردم، چاوەکانی ئاگریان لێ دەباری.
- من لەم کونەدام و شمشێر بۆ سوارە کاتۆ دروست دەکەم. شەو و ڕۆژ خەریکی شمشێردروستکردنم بۆی. سوارەکاتۆ ئەمە دەزانێ، بەڵام شتێک هەیە کە نایزانێ ئەویش ئا ئەمەیە.
ئاسنگەرەکە خۆی بەرەو تاریکترین سووچی ماڵەکە کێش کرد و لە کونێکی شاخەکەدا شمشێرێکی دەرهێنا. شمشێرەکە وەک بڵێسەی ئاگر لەدەستیدا دەبریسکایەوە.
ـ بە درێژایی هەزاران هەزار ساڵ لە هەوڵی دروستکردنی شمشێرێکدا بووم کە ئاوەزای بەرد لەتکردنی هەبێ، بەڵام تا ئەمشەو هەموو هەوڵێکم بە خەسار دەچوو و، تا بۆ ئاخر جار، ئەمشەو، سەری گرت.
شمشێرەکەی بەرز کردەوە و بە یەک لێدان قڵیشێکی گەورەی کردە دیواری چیاکە و لەبەرخۆیەوە وتی: ئای شمشێرەکەم، شمشێرە کلیلەدارەکەم. ئەو شمشێرەی کە دەتوانێ بەرد لەت بکات!

دەخستە دڵەوە. وەستام تا سەیریان بکەم، ئەوسا ئاسنگەرەکە وازی لە هاوار و نەڕەنەڕ هێنا و هاتە پێشەوە بۆ لای من.
وتی: شمشێرەکانم دەبینی. شمشێرە تیژەکانم دەبینی. ئەمانەم هەموو بۆ سوارەکاتۆ دروست کردووە. بۆ خۆشم ئاسنگەری سوارەکاتۆم.
پرسیم: ئەگەر ئاسنگەری ئەوی، ئەی بۆچی هاوار دەکەی "با بمرێ سوارەکاتۆ"؟
بە شێوەیەک مستی خۆی گوشی ئێسکەکانی سەر دەستی سپی هەڵگەڕان.
وتی: چونکە کەس نییە بەقەد ئاسنگەرەکەی سوارەکاتۆ ڕقی لە سوارەکاتۆ ببێتەوە.
تا ئەو کاتەش ئەو کۆت و زنجیرە پۆڵایینەم نەدیبوو، کە سەرێکی بە قاچیەوە بەسترابوو و، سەرەکەی تریشی بە قەد تاشی چیاکەوە بەسترابوو، کاتێ بەناو ماڵەکەیدا دەڕۆیشت، زرم و هوڕی ئەو ناوەی پڕ دەکرد.
لێم پرسی: - بۆچی بە قەد چیاکەوە کۆتکراوی، بۆ کۆت و زنجیرەکەت ناخەیتە سەر ئاگرەکە و داخی ناکەیت، تا دوایی بتوانیت لەسەر دەزگاکەت بە چەکوش پارچە پارچەی بکەی؟
ئاسنگەرەکە وتی: سوارەکاتۆ لێرە منی کۆت و زنجیر کردووە. هیچ ئاگرێکیش کار لە زنجیرەکانی سوارەکاتۆ ناکات و هیچ پیکێکش کار لە زنجیرەکانی ئەو ناکا و نایشکێنێ. ڕقەزنجیرەکانی سوارەکاتۆ هەروا بەئاسانی ناپسێن.

لێم پرسی: بۆ دەبێ تۆ کۆتی ڕق و قینی ئەوت لە پێدا بێ؟
وتی: چونکە من ئەو کەسەم کە شمشێر دروست دەکەم، ئەو شمشێرە دروست دەکەم کە خەڵکی چاک و بێگوناهانی پێ دەکوژرێ. هەر لەبەر ئەوەشە سوارەکاتۆ بە زامنترین کۆت و زنجیری خۆی منی لێرە بەستۆتەوە. ئەو بێ شمشێرەکانی من کاری مەیسەر نابێ.
ئاسنگەرەکە بە شێوەیەک سەیری دەکردم، چاوەکانی ئاگریان لێ دەباری.
– من لەم کونەدام و شمشێر بۆ سوارە کاتۆ دروست دەکەم. شەو و ڕۆژ خەریکی شمشێردروستکردنم بۆی. سوارەکاتۆ ئەمە دەزانێ، بەڵام شتێک هەیە کە نایزانێ ئەویش ئا ئەمەیە.
ئاسنگەرەکە خۆی بەرەو تاریکترین سووچیماڵەکە کێش کرد و لە کونێکی شاخەکەدا شمشێرێکی دەرهێنا. شمشێرەکە وەک بڵێسەی ئاگر لەدەستیدا دەبریسکایەوە.
ـ بە درێژایی هەزاران هەزار ساڵ لە هەوڵی دروستکردنی شمشێرێکدا بووم کە ئاوەزای بەرد لەتکردنی هەبێ، بەڵام تا ئەمشەو هەموو هەوڵێکم بە خەسار دەچوو و، تا بۆ ئاخر جار، ئەمشەو، سەری گرت.
شمشێرەکەی بەرز کردەوە و بە یەک لێدان قڵیشێکی گەورەی کردە دیواری چیاکە و لەبەرخۆیەوە وتی: ئای شمشێرەکەم، شمشێرە کڵپەدارەکەم. ئەو شمشێرەی کە دەتوانێ بەرد لەت بکات!

لێم پرسی: تۆ شمشێرێکت بۆ چییە، کە بتوانێ بەرد لەت بکات.

ئاسنگەرەکە وتی: هەر ئێستا بۆت دەردەکەوێ. ئەم شمشێرە بۆ گیانی چاک و بێتاوانان دروست نەکراوە. ئەم شمشێرە لێرەدا لە چاوەڕوانی سوارەکاتۆدایە. سوارەکاتۆش دڵێکی هەیە لە بەرد، تۆ بۆ خۆشت ئەمە دەزانی، وانییە؟

وتم: نەء، من زۆر کەم دەربارەی سوارەکاتۆ دەزانم، هەر ئەوەندە دەزانم هاتووم بچم بەگژیدا و شەڕی لەگەڵ بکەم.

ئاسنگەرەکە وتی: ئەو دڵێکی ڕەقی وەک بەرد و چنگێکی پۆڵایینی هەیە.

وتم: چنگێکی پۆڵایین!

ئاسنگەرەکە وتی: ئەی نازانی، دەستی ڕاستی سوارەکاتۆ پەڕیوە و لە جێگەیدا چنگێکی پۆڵایینی هەیە.

لێم پرسی: چی بە چنگە پۆڵایینەکەی دەکات؟

ـ سنگی خەڵکی پێ شەق دەکات و دڵیان دەردەهێنێ، بە مشتێک و هەر ئەوەندەت زانی دڵەکە دەرهاتووە. دوای ئەوە دڵێکی بەردین لە جێی دادەنێ. ئەو وای بڕیارداوە، هەموو ئەوانەی لێوەی نزیکن دەبێ دڵیان لە بەرد بێت.

کە ئەمەم بیست، موچڕکەیەک بە لەشمدا هات. تا دەهات زیاتریش تاسە و ئارەزووی بەگژاچوون و شەڕی سوارەکاتۆم دەکرد.

ئاسنگەرەکە لە تەنیشتمەوە وەستابوو. دەستە بە دووکەڵ ڕەشهەڵگەڕاوەکانی بە شمشێرەکەدا هێنا. بێگومان ئەوە بەنرخترین شتێک بوو کە هەیبوو.



داوام لێکرد: شـــمـــشـــێــرەکــەتم بدەرێ کــە بــەرد لەت دەکــات، شمشێرەکەتم بدەرێ، تا بتوانم لەگەڵ سوارەکاتۆدا بجەنگم.
ئاسنگەرەکە ڕاما و تاوێکی زۆر بە بێدەنگی وەستا و سەیری کردم.
پاشان وتی: ها ئەوە شمشێرەکەم، ها ئەوە شـمشێرە کلّپەدارەکەم.
ئەمەش تەنیا هەر لەبەر ئەوەی تەوێلّت هێندە ڕۆشن و نیگات هێندە گەشە و هێندە خۆشیش لە چیاکەمدا شمشاڵت لێ دەدا.

شمشێره کڵپەدارەکەی دایە دەستم، وەک ئەوە وابوو ئاگرێکی لێوە دەرچێ و سەرتاپای لەشم داگرێ، ئەمەش ئەوەندەی تر بەهێزی کردم.
دوایی ئاسنگەرەکە بەرەو قەدی چیاکە ڕۆیشت و دەلاقەیەکی گەورەی کردەوە. هەستم کرد بایەکی ساردی سەهۆڵین هورووژمی هێنایە ژوورێ و گوێم لە دەنگی هاژەی شەپۆلی زەریا بوو.
ئاسنگەرەکە وتی: سوارەکاتۆ زۆر شت دەزانێ، بەڵام ئەوە نازانێ کە من چیاکەم کون کردووە و دەلاقەیەکم کردۆتە زیندانەکەم. چەندین ساڵ خەریکی هەڵکۆڵین بووم، تا کونێ بکەمە دیواری زیندانەکەم.
لە کونەکە چوومە پێشەوە و سەیری دەرەوەم کرد، زەریاچە مردووەکەم بینی کە ڕووە و قەڵاکەی سوارەکاتۆ هەڵکشابوو. دیسان شەو داهاتبوو، قەڵاکەش لەو ناوەدا، هەروەک دواجار کە دیبووم، ڕەش و تاریک ڕاکشابوو. هەر عەینەن دواجاریش یەکێک لە پەنجەرەکانی وەک چاوێکی بەد بەسەر ئاوی زەریاچە مردووکەوە دەسووتا.
یوم-یوم هات و لەتەنیشتمەوە وەستا، ئێمە قڕوقەپ لەوێدا ڕاوەستابووین و بیرمان لەوە دەکردەوە، کە هاکا شەڕەکە بقەومێ. ئاسنگەرەکە لەپشتمانەوە وەستابوو و، گوێم لە دەنگی بوو، لەبەرخۆیەوە دەیوت:
ـ هێندەی نەماوە، هێندەی نەماوە دواشەڕی سوارەکاتۆ بقەومێ. هێندەی نەماوە.

# چنگی پۆلایین

هەوری ئاسمانی سەر زەریاچەکە تاریک بوو، هەواش پڕی بوو لە قاووقیژی باڵندە سیحرلێکراوەکان. لەو دەرە، شەپۆلەکان ڕەشەکەفیان دەچەراند، ئەو شەپۆلە هەڵچووانەی، کە دەبووایە بەلەمەکەمان بەسەر زەریاچەی مردوودا هەڵ بگرن و، ڕەنگە فرێی بدەن و بیدەن بە زناری ژێر قەڵاکەی سوارەکاتۆدا و لەتلەتی بکەن.

شمشێرسازەکە لەدەم ئەشکەوتەکەیدا وەستابوو، سەیری خوارەوەی دەکرد، لەو حەلەدا کە من خەریکی کردنەوەی پەتی بەلەمەکە بووم، کەوا لە کەنداوێکی ناو چیاکەدا لەنگەری گرتبوو، کە لەنێوان تاوێرە بەرزەکاندا شارابۆوە.

شمشێرسازەکە وتی: سوارەکاتۆ زۆر شت دەزانێ، بەلام بەوە نازانێ کە زەریاچەی مردوو زمانەیەکی لێ بۆتەوە و تا ژێر چیاکەی من کێشمانەی داوە، هیچیش لەمەڕ کەنداوە نهێنییەکەم و لەنگەرەکەی ژێر ئەشکەوتەکە نازانێ.

من لێم پرسی: تۆ بەلەمت بۆ چییە، کە ناتوانی بیاژۆی.

ـ دەتوانم بیاژۆم، شمشێرسازەکە وتی، لە ئەشکەوتەکە دێمە دەرەوە، کۆت و زنجیرەکەم چەندێ برِ بکا ڕای دەکێشم، ئەو کاتە دەتوانم سێ بە قەد درێژی بەلەمەکە لە کەنداوە نهێنییەکەمدا سەوڵ لێ بدەم.

لە دەرگـــای ئەشکەوتەکـــەدا، گـەورە و ڕەش، لەو حـــەنەی بـەسـبـەر لەنگەرەکـەدا دەڕوانێ، ڕاوەسـتـابوو. ئەوەندە تاریک بوو مـن بەحـاڵ ئەوم دی، بـەڵام گـوێـم لێ بـوو، بە چ قـــاقـــایەکی بەرز و ســەیر پێ دەکـەنی. هەر لەوە دەچوو، کـە ئەزانێ پیـاو چۆن پێ دەکـەنێ. وتی: سـوارەکاتۆ زۆر شت دەزانێ، بـەڵام شتێکی دیش هەیە کە نایزانێ، ئەو نازانـێ ئەمـشـەو باری بەلەمـەکـەم بـەسـەر زەریاچەی مـردوودا چییە.

من وتم: شـــتـــێکی تـریش هەیـە، کـە تۆ نایزانی، تۆ نـازانێ ئاخـــۆ جـارێکی دی بـەلەمـەکەت دەبینیتـەوە. ئەمـشـەو ڕەنگە بکەوێتە بنی زەریاچەکەوە. بێشکەئاسـا، شـەپۆلەکـان دەیبـەن و دەیهـێنن لە بنی بنـەوەی زەریاچـەی مـــردوودا، لەو بێـــشـکـەیەشـــدا یوم-یوم و مـن نووستوین. ئەی ئەو وەختە تۆ دەڵێی چی؟

شمشێرسازەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

ئەو کاتە من تەنیا دەڵێم: باش بنوو، میرمیۆ! خـەوی خێرت بێ لەو بێشکەیەدا کە شەپۆلەکان ڕایدەژەنن!

دەستم کردە سەوڵلێدان و چیتر شـمشێرسازەکەم نەدی. لەتاریکیدا ون بوو، بـەڵام هاواری دەکـرد بەدوامـــاندا، پێش ئەوەی ئێـمـــە لەو بەندەرە تـەسکەی نێـوان کـەنداوی نهـێنیی شــمـشـێـرسـازەکـە و زەریاچەی مردوو دەرچین. گوێم لێ بوو بە دەنگی نزم بانگی کردین.

- ئاگـاداری خـۆت بە، مـیـرمـیـۆ، هاواری کـرد. هۆشـیـار بە، کـە جنگێکی پۆڵایین دەبینی، ئەگـەر یەکسـەر دەست نەوەشێنی، ئیـتـر ئەوە حسابت ڕۆیشتووە.



میرمیۆ لەناوچوو، زناری چیاکانی ئەو دەورپشتە دەیانچپاند.

میرمیۆ لەناوچوو، میرمیۆ لەناوچوو. زناری چیاکان لەو دەوروبەرە دەیانچپاند، ئەوەندە خەمهاوەر بوو. بەڵام وەختی بیر بەوەوە خەریککردنم نەبوو، چونکە هەر ئەو ساتە شەپۆلە دڕەکانی زەریاچەی مردوو هووڕووشیان هێنایە سەر بەلەمەکەمان و بازرەقەیان پێ بەست و لە چیای شمشێرسازەکەیان دوورخستەوە.

ئێمە بەسەر هاژوهووژی قووڵاییەکەوە دەمانئاژوا. لە وشکایی زۆر دوور کەوتبووینەوە. یوم-یوم و من، هەستمان کرد چەند بچووکین و چەند دەترسین.

یوم-یوم وتی: ئەگەر بەلەمەکەشمان هێندە گچکە نەبووایە، ئەگەر زەریاچەکە هێندە قووڵ و شەپۆلەکان هێندە بەهێز نەبوونایە، ئێمەش هێندە بچووک و تەنیا نەبووینایە!

نای، ئەو شەپۆلانەی دەریاچەی مردوو چەند بەهێز بوون! هەرگیز شەپۆلی وا بەهێزم نەدیبوو. شاڵاویان بۆ هێناین، پێماندا هەڵپرژان و فڕێیان داینە ناو گەرووی شەپۆلە تازە و تووڕەکانی ترەوە. ئاسان نەبوو هەوڵی سەوڵلێدان بدەی. من و یوم-یوم هەردووکمان سەوڵەکەمان گرتبوو، شەپۆلێکی دڕ بە هاوار هات و سەوڵێکی لە دەست بەردواینە خوارەوە. شەپۆلێکی کەفچەڕێنی دیش هات و سەوڵەکەی تریشی لێ فڕێداین، دواتر چەند شەپۆلێکی بە هاژە و گڕ و فڕی سارد هاتن و بە بەرزی دەوری ئێمە و بەلەکەمانیان گرت و دابوویانینە ناو، بەلەمیش وەک خۆمان بچووک و لاواز و بێنموود بوو.

یوم-یوم وتی: ئێمە ئیتر بێ سەوڵین، هاکا زانیت بەلەمیشمان نەما. کاتێ شەپۆلەکان هەڵیدەگرن و دەیدەن بە زنارەکانی سوارەکاتۆدا و هەلاهەلای دەکەن. ئیتر چ پێویستییەکمان بە بەلەم نابێ.

لە هەموو لایەکەوە باڵندە سیحرلێکراوەکان بە شەقەی باڵ هاتن. ئەڵقەیان دا بە دەورماندا و قیژە و داد و بێدادیان بوو. ئەوەندە بە نزمی و نزیکی دەفڕین دەمتوانی چاوە بریسکەدارە خەمناکە باڵندەییەکانیان لەتاریکییەکەدا ببینم.

- ئەرێ تۆ براکەی نوونووو نیت، لە یەکێکیانم پرسی.

- خوشکە بچکۆلەکەی یریت، لە یەکێکی تریانم پرسی.

بەڵام ئەوان بە چاوە بریسکەدارە خەمناکە باڵندەییەکانیان سەیریان کردم، هاواریان بوو لە دەس خەم و پەژارە.

هەرچەندە بەلەمەکەمان بێ سەوڵ و لەژێر دەس دەرچوو بوو، بەڵام ڕێک و ڕاست بەرەو قەڵاکەی سوارەکاتۆ چووین. شەپۆلەکان بەرەو ئەوێیان بردین، ویستیان بماندەن بە قەد زنارەکاندا و تێکمان بشکێنن و لەبەر پێی سوارەکاتۆدا بمرین.

زیاتر لەو زنارە ترسناکە و لەو قەڵا ڕەش و لەو چاوە پیسە ڕوانیوە نزیک دەبووینەوە و شەپۆلەکان خێراتر و بەهێزتر دەبوون.

یوم-یوم وتی: ئێستە، هەر ئێستە تیادەچین میۆ.

شتێکی سەیر ڕووی دا. عەینەن لەوەختێکدا ئێمە بە تەمای مردن بووین، شەپۆلەکان دامردنەوە و هێوربوونەوە و لە جووڵە کەوتن.

بەهێواشی و نەرمی بەلەمەکەمانیان بە تەنیشتی کاچە ترسناکەکەدا برد بەرەو زنارە ڕەش و گرنجگرنجەکەی ژێر قەڵاکەی سوارەکاتۆ.
بۆچی لەپێشدا شەپۆلەکان وەها بەتوندی خرۆشان و دوایی هێوربوونەوە، تێ نەگەیشتم. ڕەنگە ئەوانیش ڕقیان لە سوارەکاتۆ بووبێ و زۆر حەزیان کردبێ یارمەتیی ئەو کەسانە بدەن کە هاتوون لە دژی بجەنگن. ڕەنگە زەریاچەی مردووش، جاران زەریاچەیەکی شین و دڵشادی نێوان زنارە ئەمینەکان بووبێ. زەریاچەیەکی بچووکی وا کە لە ڕۆژانی هاویندا تیشکی هەتاو کردبێتی بە ئاوێنە بۆ خۆی، لەوێ شەپۆلە بچکۆلە دڵنەرمەکان یارییان لەگەڵ بەردی چیاکان کردبێ، قاقای منداڵان بەسەر ئاوەکەدا فڕیبێ، نەک وەک داد و بێدادی ئێستای باڵندە سیحرلێکراوەکان. دیارە بۆیە شەپۆلەکان ئاوا هاژە و هاواریان بوو بەدەورماندا و دیوارێکی کەفچەڕێنیان لەنێوانی ئێمە و ئەو چاوە پیسە ڕوانیوەی قەڵاکەدا بەرز کردبۆوە.
من وتم: سوپاس ئەی زەریاچەی میهرەبان، سوپاس ئەی هەموو شەپۆلە بەهێزەکان!
بەڵام هیچ شەپۆلی لێ نەمابوو. ئاوەکە ئارام و کشومات و ڕەش ڕاکشابوو، وەڵامی نەدایەوە.
بەسەر سەرمانەوە، بەو بەرزاییەوە، لەو ماهە تووش و سەختەدا قەڵاکەی سوارەکاتۆ شانی دادابوو. ئێمە ئیتر لە کەنارەکەی لای

ئەودا بووین. ئەوەندە لێوەی نزیک بووین، کە هەرگیز پێشتر وا نەبووین، ئەمشەویش شەوی شەڕ بوو. من لە خۆم دەپرسم، ئایا ئەوان زانیویانە، ئەوانەی ئێرە کە هەزاران ساڵە چاوەڕوانن. من دەپرسم، ئاخۆ ئەوان زانیویانە، کە لەم شەوەدا دەبێ شەڕەکە بقەومێ و ئەوان منیان بەبیردا هاتووە. ئەی بابەشام بیری لای من بووە؟ من هیوادارم وابێ، من زانیم، کە ئەو وای کردووە. من دەزانم، کە لە شوێنێکی چەپەک و دووردا بەتەنیا دانیشتووە و بیری لای منە، خەمبارە و لەبەرخۆیەوە دەچپێنێ: - میۆ، میۆکەی من!

دەستم دایە شمشێرەکەم، دەتوت ئاگر لەناو دەستمدایە. ئەوە شەڕێکی ئەوەندە ترسناک بوو کە من دەبوایە بیکەم، ئیتر ئۆقرەشم لەبەر بڕابوو چیتر چاوەڕێی بکەم. من تاسووق بووم بە سوارەکاتۆ بگەم، تەنانەت ئەگەر مەرگیشمی پێوە بێ. ئیتر دەبوو شەڕەکە ببێ، تەنانەت ئەگەر کۆتاییەکەشی ئەوە بێ سەری مێوی تێدا بچێ.

یوم-یوم وتی: میۆ، برسیمە.

ئەوەی پێمان مابۆوە لە نانی سکی برسی تێرکەر هێنامە دەرەوە، لەپاڵ ئەو بەردەی ژێر قەلاکەی سوارەکاتۆدا خواردمان. هەستمان کرد تێر و پڕ و بەهێز و تەنانەت دڵخۆشیش بووین، کە ئێمە ئەوەمان خوارد، بەلام ئەوە دوا کوتەنانمان بوو، نەشماندەزانی کەی جارێکی تر نانمان دەست دەکەوێ بیخۆین.

- ئێستە پێویستە ئێمە بەرەو ژوور بە زنارەکەدا هەڵزنێین، من بە

یوم-یومم وت، ئەمە تەنیا حاڵەتێکە پێی بگەینە قەڵاکەی سوارەکاتۆ.

یوم-یوم وتی: ئەمە قسەی لەسەر نییە.

دەستمان کرد بە هەڵزنان بە قەد چیاکەدا، کە زۆر بەرز و سەخت و تووش بوو.

یوم-یوم وتی: ئەگەر ئەم تاشە هێندە تووش نەبووایە، ئەگەر شەوەکەشی هێندە تاریک نەبووایە و ئێمەش هێندە بچووک و تەنیا نەبووینایە.

هەڵزناین و هەڵزناین. ئەوەندە بە هێواشی بۆمان دەچووە سەر، ئەوەندە نارەحەت بووین. بە دەست و قاچ خۆمان قایم دەکرد، بە شوێن چاڵ و تۆقلەبەرددا دەگەڕاین، خۆمان گیر دەکرد و هەڵدەزناین. هەندێ جار ئەوەندە دەترسام، وام هەست دەکرد کە ئیتر تەواو، ئێستا دەکەومە خوارەوە و، هەموو شتێ بە فیڕۆ دەڕوا. بەڵام لە دواچرکەدا شتێکم دەدییەوە خۆمی پێوە قایم بکەم. لەوە دەچوو تاشەکە خۆی شتێ بخاتە ژێر پێمەوە، لەکاتێکدا لەوەبوو بەرببمەوە. ڕەنگە تەنانەت ئەو تاشە سەختەش ڕقی لە سوارەکاتۆ بێ و حەز بکا یارمەتیی ئەو کەسە بدا، کە هاتووە لە دژی بجەنگێ. زۆر بە بەرزییەوە، بەسەر ئاوەکەوە قەڵاکەی سوارەکاتۆ دەیڕوانی، ئێمەش دەبووایە بۆ بەرزایی هەڵزنێین، تا بگەینە شوورەی قەڵاکە، کە بە بەرزترین شوێنی تاشەکەوە بوو.

- ها ئێستە تۆزێکی تر، دەگەینە سەرەوە، چپاندم بە گوێی

یوم-یوممدا . هەر خێرا بەسەر شوورەکەدا هەڵدەزنێین و دوایی...
ئەوساکە من گوێم لە دەنگەدەنگ بوو. سیخوڕەکان بوون، بەو شەوە لەگەڵ یەکتر دەدوان. دوو سیخوڕی ڕەشپۆش بوون بەسەر شوورەکەوە.
- بگەڕێن، هەموو شوێنێ بگەڕێن، پەیامی سوارەکاتۆیە، کە پێویستە دوژمن بگیرێ. فەرمانی سوارەکاتۆیە، دەبێ ئەو دوژمنەی بە سواری نۆما سپییەکە هاتووە بگیرێ. ئەشکەوتی چیاکان، ناو داری دارستانەکان، ئاو و هەواش بگەڕێن، نزیک و دوور، هەموو شوێنێ بگەڕێن!
یەکێکی دی وتی: نزیک بگەڕێن، نزیک بگەڕێن، ئێمە ئەوانەین کە نزیک دەگەڕێین، ڕەنگە دوژمن لەنێو ئێمەدا بێ. ڕەنگە بە شەو بیەوێ سەرکەوێتە سەر شوورەی قەڵاکە، هەموو شوێنێ بگەڕێن!
دڵم وەختەبوو لە لێدان بوەستێ، کە بینیم مەشخەڵێکی هەڵکرد. ئەگەر شەوقی مەشخەڵەکەی بەرەوخواری شوورەکە بکردایەتەوە، لەوانەبوو ئێمە ببینێ. گەر ئێمەشی بدیایە ئەوا بە فەتەرات دەچووین. ئەو دەیتوانی ڕمە درێژەکەیمان یەکجار تێسرەوێنێ و بەس بوو. ئیتر پێویستی بەوە نەدەبوو بەدوای ئەو دوژمنەدا بگەڕێن، کە بە نۆما سپییەکە هاتووە. لە کاتی بەربوونەوەماندا بۆ زەریاچەی مردوو سووکە هاوارێک دەبیسترا و ئێمە ئاوەوئاو دەچووین و بۆ هەمیشە وندەبووین.
- بگەڕێن، هەموو شوێنێ بگەڕێن، یەکێک لە سیخوڕەکان وتی.

زناری قەد قەڵاکە بدەرە بەر تیشکی مەشخەڵەکەت، ڕەنگە دوژمن ئێستە بە چنگەکرێ بەرەو ئێرە بێ، هەموو شوێنێ بگەڕێن!

ئەوەیان کە مەشخەڵەکەی بە دەستەوە بوو، خۆی بەسەر شوورەکەدا نووشتاندبۆوە، تیشکەکە دەیدا لە زناری شاخەکە، ئێمە خۆمان بەیەکەوە نووساندبوو، دەتوت دوو مشکی چاو بە پشیلە کەوتووین.

تیشکی مەشخەڵەکەش تا دەهات نزیکتر دەبۆوە، شوورەکەی درێژتر دەگرتەوە و زیاتر خۆی نزیک دەکردەوە.

یوم-یوم چپاندی: هەر ئێستە، ئای میۆ، هەمووی بە با چوو!

بەڵام شتێکی سەیر ڕووی دا. لە زەریاچەکەوە پۆلێ مەل بە شەقەی باڵ هاتن. هەموو باڵندە سیحرلێکراوەکان بە هاژەی باڵیانەوە هاتنە بەرەوە. یەکێکیان ڕێک خۆی دا بە مەشخەڵەکەدا و لە دەست سیخوڕەکەی بەردایە خوارەوە. ئێمە بلاچەی گڕێکمان دی بە هەوادا بەرەو خوار و قووڵایی کشا. کاتێ مەشخەڵەکە کوژایەوە و لە زەریاچەکەدا نوقم بوو، گوێمان لە نرکەیەک بوو. ئەو باڵندەیەی ڕزگاری کردین، سووتا. بە باڵە سووتاوەکانییەوە لە شەپۆلەکانی زەریاچەی مردوودا نقوم بوو.

ئێمە هێندە پەژارەی باڵندەکە دایگرتین.

- سوپاس، باڵندە بچکۆلە گوناحەکە، من چپاندم، هەر چەندە دەشمزانی، کە باڵندەکە ئیتر توانای ئەوەی نەماوە نە گوێی لەوە و نە لە هیچی تر بێت.

دەمویست بۆ باڵندەکە بگریم، بەڵام ناچاربووم ئاگام لە

سیـخـوڕەکـان بێ. هێـشـتـا سـەرنەکـەوتووینەتە سـەر شـوورەکە و مەترسییەکی زۆریش چاوەڕێمان دەکا.

سیـخـوڕەکـان هێندە ڕقـیـان لەو باڵندەیە هەسـتـابوو. ئەوان هەر بەسەر سەرمانەوە بەسەر شوورەکەوە نزیک وەستابوون. دەمتوانی سەرە ڕەش و ناقۆڵاکانیان ببینم و گوێم لە دەنگە ناهەموارەکانیان بێ، کاتێ لەگەڵ یەک خەریکی چپ و هوور و قسە و قسەلۆک بوون.

ئەوان وتیـان: بگەڕێن، هـەموو شـوێنێ بگەڕێن، ڕەنگە دوژمن دوور کەوتبێتەوە، ڕەنگە لە شوێنێکی ترەوە، بە قەد زنارەکەدا، هەڵزنێ. هەموو شوێنێ بگەڕێن!

ئەوان هـەنگاوێک کـشـانە دواوە و لە لایەکی دییـەوە چاودێرییـان دەکرد.

من چپاندم بە گوێی یوم-یومدا: ئێستە، هەر ئێستە!

سەرکـەوتینە سـەر شـوورەکە، هەر سـەریشـکەوتینە سـەرێ، خێرا ڕامانکردە تاریکییـەکەی قـەڵاکەی سوارەکاتۆوە و خـۆمان نووساند بە دیوارە ڕەشـەکەوە. بێ دەنگ و مـتەق وەسـتـاین، زۆریش ترسـاین لەوەی سیخوڕەکان بماندۆزنەوە.

یوم-یوم چپـاندی: چۆن پیـاو دەتوانێ خـۆی بکا بە قـەڵاکـەی سوارەکاتۆدا، چۆن پیاو دەکاتە ناو ڕەشترین قەڵای دنیا؟

هـەر ئەمـەی لە زار دەرچوو، دەروازەیەک بووە دیوارەکـە. زۆر بە بێـدەنگی دەروازەیەکی ڕەش لەتەنیـشـتـمـانەوە خـۆی کـردەوە.

سـووسـەی دەنگێک چییـە نەدەبیـسـترا. ئەو بێدەنگییـە ئەوەندە



هەستمان کرد کە قەت پێشتر هێندە بچووک و ترساو نەبووین.

ناخـۆش و بەسـام بـوو، لە هیـچی تر نەدەچوو. هەر هیچ نـەبووایە، دەروازەکە لە کاتی کردنەوەدا جیڕەیەکی لێوە بهاتایە! ئەگەر هێندە نزم نەبووایە دەنگی، ئەوەندە ترسناک نەدەبوو. بەڵام ئەمە نتمترینی هەموو دەروازەکان بوو.

لەگەڵ یوم-یومـدا دەسـتی یەکمـان گرت و خۆمـان کرد بە قـەڵاکەی سوارەکـاتۆدا . هـەستمـان بە بچووکی خۆمـان کـرد و پێشـتریش قەت وا نەترسابووین.

تاریکییـەک نەبوو کـە لەمـە بچێ، چ سـاردییـەکی سـەهـۆڵینە لەمـە ساردتـر بێ، هیـچ بێـدەنگییـەکیش هـەرگیـز وەک ئـەمـەی قـەڵاکەی سوارەکاتۆ ناهەموار نەبووە، لە دەرگاکەوە پێپیلکەیەکی باریکی لار و پێـچی تاریک بـەرەو سـەرەوە هـەبوو. ئەوە بەرزترین و تاریکتـرین پێپیلکانەیەک بوو من دیبێتم.

یوم-یوم چپاندی: ئـەگـەر تاریکییـەکەش هێندە ترسـناک نەبووایە و سـوارەکـاتۆش هێـندە دڕندە و ئێـمــەش ئەوەندە بچـووک و تەنیـا نەبووینایە!

شـمشێـرەکەم توند گـرت و لەگـەڵ یوم-یومـدا ، من لە پێشـەوە و ئەو بەدوامدا ، بە پێدزکە بە پێپیلکانەکاندا سەرکەوتین.

جـاروبـار لەخـەوندا چوومـەتە خـانووی تاریکی واوە کـە نەمـدیوە خـانووی نەدیتـووی تاریکی تـرسناک، کە ژووری ڕەشی تێدا بووە و خـڕ دەرگـای لەسـەر داخسـتـووم و بەندی کـردووم، بە شـێـوەیەک، نەمتـوانیوە هـەناسە بدەم، هـەروەها ناوفەرشـەکەی بۆشـایی ڕەشی

خۆی کردۆتەوە بۆ ئەوەی تێی بکەوم، یا پێپیلکانەیەک کە داویەتی بەیەکدا بۆ ئەوەی هەڵدێرێم، بەڵام هیچ خانوویەکی نێو خەون هێندەی قەلاکەی سوارەکاتۆ ترسناک نەبووە.

بە پێپیلکە بەرز و لار و پێچپێچکەدا ڕۆیشتن و نەشماندەزانی دوای تەواوبوونی چی هەیە.

یوم-یوم لەدوامەوە چپاندی: میۆ، دەترسم. لام کردەوە بەلایدا بۆ ئەوەی دەستی بگرم. هەر ئەو کاتە ونبوو. بڵێی لەناو دیوارەکەدا ونبووبێ، بێ ئەوەی پێی بزانم. بەتەنیا لە پێپیلکەکەدا مامەوە، هەزار جار تەنیاتر لەو جارەی کە لە چیای شمشێرسازەکەدا لێک دابڕاین، هەزار جار تەنیاتر لە هەر جارێکی پێشووتر. ئەوەندە خەم دایگرتم، زاتی هاوارکردنم نەبوو، بەڵام دەستە لەرزیوەکانم برد بۆ سەر ئەو دیوارەی، کە یوم-یومی لێوە ونبوو. من گریام، چپاندم: یوم-یوم تۆ لەکوێی؟ یوم-یوم کوڕە دەبگەڕێرەوە!

بەڵام دیوارەکە سارد و ڕەق بوو لە ژێر دەستمدا . هیچ درزێکی تێدا نەبوو کە یوم-یومی لێوە بێتە دەرێ و هەموو شتێکیش وەک پێشتر کڕ و بێدەنگ بوو. یوم-یومیش هیچ وەڵامی نەبوو، کاتێ من گریام و چپاندم، هەموو شتێ بێ دەنگ بوو.

کاتێ ویستم دیسان بەسەر پێپیلکەکاندا سەرکەومەوە، کەسێک لەدنیادا نەبوو ئەوەندەی من تەنیا بێ. هەنگاوێ نەبوو هێندەی ئەوانەی من قورس هەڵبهێنرێنەوە. بەحاڵ دەمتوانی پێم بەرز بکەمەوە، پێپیلکەکانیش ئەوەندە بەرز و زۆر بوون.



به خەیاڵمدا هات، بەر دەبمە خوارەوە و هەمووی بە فیڕۆ دەڕوا.

ئەوەندە زۆر بوون... بەڵام دواپلەیشیان هەبوو. نەشمزانی کە ئەمە دوایینیانە و ئیتر تەواو دەبێ. پیاو لەتاریکیدا بەسەر قادرمەدا دەڕوا نازانێ چۆنە، هەنگاوێکم هەڵهێنایەوە و پێم دای لە بۆشایی. هاوارم کرد و کەوتم، لە کاتی بەربوونەوەکەدا ویستم خۆم توند بگرمەوە، بەختم یار بوو، خۆم بە دواپلەوە گیرساندەوە. لەوێ بەحەواوە بووم، قاچم بەیەکدا دەدا و بە پێم بە شوێن شتێکدا دەگەڕام لەسەری بوەستم، بەڵام هیچ نەبوو. بەسەر چاڵاییەکی بێبنی ڕەشەوە بەحەواوە دەخولامەوە. زۆر دەترسام. بە خەیاڵمدا هات، زۆر نابا دەکەومە خوارەوە، ڕەنجم بێهوودە دەبێ. کەسێ بێ فریام کەوێ، هاوار یارمەتیم بدەن!

کەسێ بە پێپیلکەکاندا هات، بڵێی یوم-یوم گەڕابێتەوە.

من چپاندم: یوم-یوم گیان یارمەتیم بدە!

ئەوەندە تاریک بوو ئەوم نەدی. سیما ئازیزەکەی و چاوەکانیم نەدی کە لە چاوی بێنکا دەچوون، بەڵام یەکێک چپاندی بە گوێمدا.

ئەو کەسەی من بە یوم-یومم زانی، چپاندی: دەستم بگرە با یارمەتیت بدەم.

دەستیم گرت، بەڵام ئەوە دەست نەبوو، چنگێکی پۆڵایین بوو.

# هەرگیز شمشێرێکی لەمە ترسناکترم لە قەڵاکەمدا نەدیوە

پێی ناوێ، ڕەنگە بتوانم هەر کەی بێ ئەوە لە بیر بکەم، ڕەنگە جارێکی دی سوارەکاتۆم نەکەوێتەوە یاد، من دەمەوێ ڕووخسارە ترسناکەکەی، چاوە ترسناک و چنگە پۆڵایینە ترسناکەکەیم لە بیر بچێتەوە. بە ئاواتی ئەو ڕۆژەوەم، کە ئیتر ئەوم بیر بچێتەوە. ئەوسا دەمەوێ ژوورە ترسناکەکەشی لە مێشکمدا بسڕمەوە.

ئەو لە قەڵاکەیدا ژوورێکی هەبوو، کە هەواکەی شەڕی لێ دەباری، چونکە ئەوە ژووری شەو و ڕۆژی سوارەکاتۆ بوو. شەڕ... شەڕی لێ هەڵدەوەری. شەو و ڕۆژ. شەو و ڕۆژ لەوێ بوو، شەڕی هەواڵەی دەرەوە دەکرد، هەواکەشی بە شەڕ قورس بووبوو، پیاو نەیدەتوانی هەناسەی تێدا بدا. گەرداوی شەڕ و شۆڕ لەوێوە دەچووە دەرەوە و چی شتێ جوان و زیندوو بووایە دەیکوشت و هەموو کەڵا سەوزەکان و گوڵ و گیای نەرمی وشک دەکرد و دەوەراند. خۆی ڕاکێشا بوو، وەک تارایەکی شووم پێشی ڕۆژی گرتبوو، بە شێوەیەک لەوێ هەرگیز ڕۆژی ڕوون و تەواو نەبوو، شتێکی دی بوو هەر عەینەن شەو وابوو. هیچ سەیر نەبوو کە پەنجەرەی ژوورەکەی وەکو چاوێکی بەد بەسەر زەریاچەی مردوودا پڕیسکەی دەدا. ئەوە شەڕی سوارەکاتۆ بوو کە لە پەنجەرەکەوە پریشکی دەهاویشت،

کاتێ لە ژوورەکەیدا دادەنیشت و شەڕی ڕەوانەی دەرەوە دەکرد. شەو و ڕۆژ، شەو و ڕۆژ لەوێ دانیشتبوو، شەڕی هەواڵەی دەرەوە دەکرد.

منیان دا لەبەر بەرەو ئەو ژوورە. لەکاتێکدا سوارەکاتۆ گرتمی، کە من پێویستم بە هەردوو دەستم بوو بۆ خۆگرتنەوە و نەمتوانی شمشێرەکەم بخەمە کار. دوایی سیخوڕە ڕەشپۆشەکان خۆیان دا بە سەرما و دامیان لەبەر بۆ ژوورەکەی. لەوێ یوم-یوم وەستابوو. ڕەنگی زەرد زەرد هەڵگەڕابوو، ڕووخساری خەمی لێ دەباری. کاتێ چاوی بە من کەوت، چپاندی: ئای، میۆ، ئێستە ئیتر هەموو شتێ بە فیڕۆ دەڕوا.

سوارەکاتۆ هاتە ژوورەوە و ئێمە ئەومان بە هەموو غەزەب و ترسناکییەکەوە دی. لەبەر ڕووخسارە تووڕە و غەزەبناکەکەیدا وەستابووین، ئەویش بێ ئەوەی ورتەیەکی لە دەم دەربێ، هەر سەیری دەکردین. شەڕی ئەو وەک ڕووبارێکی سارد بەسەرماندا دەڕژا، شەڕی ئەو وەک شالاوی ئاگرێک دەیویست بمانگرێتەوە، بەسەر دەست و دەموچاوماندا، دەپرژایە چاومان. لەگەڵ بای هەناسەماندا دەچووە سییەکانمان. وام هەست دەکرد، کە شەپۆلی شەڕی ئەو بە سەرتاپای گیانمدا دەڕوا. بە شێوەیەک هێندە ماندووبووم، کە نەمدەتوانی شمشێرەکەم بگرم بە دەستمەوە، تەنانەت ئەگەر زۆر هەوڵیشم بدایە. سیخوڕەکان شمشێرەکەیان بۆ سوارەکاتۆ درێژ کرد، ئەو کە بینی ڕاچڵەکی.

ـ شمشێری لەمە ترسناکترم هەرگیز لە قەڵاکەمدا نەدیوە، ئەو بەو سیخوڕە یەدەکانەی وت کە بە دەورییەوە بوون.

بەرەو لای پەنجەرەکە ڕۆیشت و لەوێ وەستا، شمشێرەکەی لە دەستیدا هەڵدەسەنگاند.

سوارەکاتۆ وتی: من چی لەم شمشێرە بکەم.

مرۆڤ، کەسانی چاک و بێتاوان بەم جۆرە شمشێرە ناکوژرێن، چی لەمە بکەم؟

ئەو بە چاوە لە هی مار چووەکانییەوە تێی ڕوانیم و بینی، کە من چەندێ بێتاقەتی شمشێرەکەمم.

سوارەکاتۆ وتی: شمشێرەکە لە زەریاچەی مردوودا نوقم دەکەم. دەیخەمە قووڵترین شوێنی زەریاچەی مردووەوە، چونکە قەت شمشێری لەمە ترسناکترم لە قەڵاکەمدا نەدیوە.

شمشێرەکەی بەرز کردەوە و لە پەنجەرەکەوە تووڕی دا. بینیم چۆن لە هەوادا لوول و پێچی خوارد، ئەوەندە دڵتەنگ بووم. هەزاران هەزار ساڵ شمشێرسازەکە خەریکی دروستکردنی شمشێرێکی وا بوو کە بەرد لەت بکات. هەزاران هەزار ساڵ خەڵک چاوەڕێی ئەوە بوون و بە ئومێد بوون من بەسەر سوارەکاتۆدا سەر بکەوم. ئێستە ئەو شمشێرەکەی فڕێ دامە زەریاچەی مردووەوە. ئیتر هەرگیز نایبینمەوە و هەموو شتێک ئاوەوئاو چوو.

سوارەکاتۆ لێمان هاتە پێشەوە و بەرانبەرمان وەستا، ئەوەندە نزیک بوو لێمانەوە، شەڕ و بەڵاکەی، هەناسەی لەبەر بڕیبووم.



سیخوڕە ڕەشپۆشەکان دەوریان دابووین.

ـ ئێستە من چی لەم دوژمنانە بکەم، سوارەکاتۆ وتی. چی لەم دوژمنانەم بکەم، کە ئەو هەموو ڕێگە دوورەیان بڕیوە و شووڵیان لێ هەڵکێشاوە کە بێن من بکوژن. هەڵدەگرێ بیرێکی لێ بکرێتەوە.
من دەتوانم بیانکەم بە باڵندە و لێیان بگەڕێم بەسەر زەریاچەی مردووەوە، هەزاران هەزار ساڵ بسووڕێنەوە و بقیژێنن.
کاتێ خەریکی بیرکردنەوە بوو، تیلەی چاوە مارئاسا ترسناکەکەی وا گرتبووینیەوە.
ئەو وتی: ئا، من دەتوانم، بە شێوەی باڵندەیان لێ بکەم، یان هەروەها، ششت، یەکسەر سنگیان شەقار بکەم و دڵیان دەربێنم و بەردێکی لە جێ دابنێم.
ویستم هاواری لێ بکەم و پێی بڵێم بمکە بە باڵندەیەک، چونکە لام وابوو، هیچ شتێ لەوە خراپتر نییە، کە مرۆڤ دڵێکی بەردینی هەبێ، بەڵام هاوارم نەکرد. چونکە زانیم ئەگەر بموتایە دەمەوێ ببمە باڵندە، ئەوا سوارەکاتۆ، بێ قرە و قاڵە، دڵی بەردینی دەدامێ.
سوارەکاتۆ، بە چاوە مارئاسا ترسناکەکانییەوە لە سەرتاپای دەڕوانین و وتی: یان فڕێیان بدەمە بورجی قەڵاکەوە و لێگەڕێم تا لەبرساندا دەمرن. من ئەوەندەم باڵندە هەن، ئەوەندە دەستوپێوەند و خزمەتکارم هەن، پێم وایە، هەر سووچی بورجەکە چاریان دەکا و لێ دەگەڕێم لەبرساندا بمرن.
ئەو ڕایەڵەی بوو لە ژوورەکەدا، هەنگاوێ دەچووە پێشەوە و دەگەڕایەوە و بیری دەکردەوە. هەرچەندیش ئەو بیری دەکردەوە، هەواکەی زیاتر قورس و پڕ نەهامەتی دەکرد.

ـ لەم قەڵایەی مندا پیاو شەوێکی بەسە بۆ ئەوەی لەبرساندا بمرێ، شەوانی قەڵاکەی من هێندە درێژ و برسییەتییەکەشی ئەوەندە زۆرە کە پیاو بە تەنیا شەوێ دەمرێ.

بەرانبەر من وەستا و چنگە پۆڵایینەکەی خستە سەر شانم: تۆ چاک دەناسم، میرمیق، هەر کە نۆما سپییەکەتم دی، زانیم تۆ هاتووی، لێرە دانیشتم و چاوەڕێم کردی. تۆش هاتی واتزانی ئەمە شەوی ڕوودانی شەڕەکەیە.

ئەو خۆی بەسەر مندا چەماندەوە و چپاندی بە گوێمدا: – تۆ پێت وابوو، کە شەوی شەڕەکەیە، بەڵام بە هەڵەدا چووی میرمیق. ئەمشەو شەوی برسیەتییە و کاتێ شەو دەبڕێتەوە لە بورجی قەڵاکەمدا هەندێ ئێسقانی سپی دەمێنێتەوە و هیچی تر. ئەوە تەنیا شتێکە کە لە میرمیق و هاوچەکەکەی بەجێ بمێنێ.

چنگە پۆڵاییەنەکەی دا بەو مێزە گەورە بەردینەی ناو ژوورەکەدا و، تاقمێکی تر سیخوڕی تازە هاتن.

ـ بیانخەنە بورجی قەڵاکەوە، ئەو وای وت و بە چڕنووکە پۆڵایینەکەی ئاماژەی بۆ کردین. بیانخەنە ئەو بورجەی حەوت قوفڵی هەیە، حەوت نۆبەتچیش بۆ چاودێری لەبەر دەرگاکەدا دانێن، حەفتاوحەوت سیخوڕ لە هەموو داڵان و پێپیلکانە و هەموو کون و قوژبنێکدا و لە نێوان بورجەکە و ژوورەکەی مندا دانێن.

ئەو لەسەر مێزەکە دانیشتبوو و گوتی:

ـ من دەمەوێ بە ئارامی لێرە دانیشم و چیتر بیری خۆم سەغڵەت

نەکەم و چیدیش تووشی گێرە و کێشەی میرمیۆ نەبم. کاتێ شەو کۆتایی دێ دەچم و سەیرێکی ئەو ئێسکە سپییانەی ناو بورجەکە دەکەم. خوات لەگەڵ میرمیۆ! بە چاکی لە زیندانی برسیکەرمدا بنوو!

سیخوڕەکان، یوم-یوم و منیان بە هەموو قەلاکەدا بەرەو بورجەکە دا لەبەر بۆ ئەوەی لەوێ بمرین، لە هەمـــوو شـــوێنێ، لە دالان و هۆڵەکاندا، ئەو سیخوڕانە وەستابوون کە دەبووایە ڕێگای نێوانی زیندانەکە و ژوورەکەی سوارەکاتۆ چاودێری بکەن. سوارەکاتۆ ئەوەندە لە من دەترسێ کە ئەو هەموو سیخوڕەی پێویست بێ؟ ئەو ئەوەندە لە کەسێکی بێ شمشێر دەترسێ کە حەوت قوفڵی لەسەر داخا و حەوت سیخوڕیش لەبەردەمیدا بۆ ئێشککگرتن دانێ؟

سیخوڕەکان، کاتێ بەرەو بورجی قەلاکە ڕاپێچیان دەکردین، بەتوندی قۆڵیان گرتبووین. بەناو قەلا ڕەشەکەدا، ڕۆیشتین و هەر ڕۆیشتین، بەلای پەنجەرەیەکی بە شیشی ئاسن چنراودا ڕۆیشتین، کە دەیڕوانی بەسەر باخی قەلاکەدا. لە ناوەڕاستی باخەکەدا ئەسپێک بە دارمێخێکەوە بەسترابۆوە. ئەسپێکی ڕەش بوو، نۆمایەکی ڕەشیشی لەتەنیشتەوە بوو. کاتێ ئەسپەکەم دی، دڵم داخورپا. چونکە میرامیسم کەوتەوە بیر و زانیم ئیتر هەرگیزاوهەرگیز نایبینم و نەمدەزانی چییان لێ کردوە و ڕەنگە مرد بێ. بەڵام سیخوڕەکان وا بەتوندی بۆ پێشەوە پەلکێشیان کردم، چیتر ماوەیان نەدا بیر لە میرامیس بکەمەوە.



ئێمە گەیشتینە بورجەکە، بۆ ئەوەی دواشەومان بەسەربەرین. دەرگا پۆلایینە قورسەکە کرایەوە و ئێمەیان خستە ژوورەوە. زرمەی دەرگا هات و خڕ لەسەرمان داخرا و گوێمان لێ بوو سیخورەکان حەوت جار کلیلیان بادا. من و یوم-یوم لە زیندانەکەماندا تەنیابووین.

زیندانەکەمان بورجە ژوورێکی خڕ بوو، دیواری بەردینی ئەستووری هەبوو. دەلاقەیەکی بە شیشی ئاسن چنراوی هەبوو، لەو دەلاقەیەوە گوێمان لە قاووقیژی باڵندە سیحرلێکراوەکان دەبوو، بەسەر دەریاچەی مردووەوە.

لەسەر عەرزەکە دانیشتین، هەستمان کرد هێندە بچکۆلە و ترساوین و، دەمانزانی کە لەگەڵ برانەوەی شەودا ئێمەش دەمرین.

یوم-یوم وتی: ئەگەر مەرگ هێندە سەخت نەبووایە، ئەگەر مردن هێندە ناڕەحەت و سەخت نەبووایە و ئێمەش هێندە بچووک و تەنیا نەبووینایە.

کاتێ یوم-یوم و من لەسەر ناوفەرشی بەردینی ساردوسڕی، زیندانەکە، دانیشتبووین، دەستی یەکدیمان گرتبوو، توند توند دەمانگوشی. برسییەتی باڵی بەسەردا دادابووین، ئەم برسیەتییە لە هیچ جۆرە برسیەتییەک نەدەچوو. ئامبازمان دەبوو و لەتلەتی دەکردین، هەرچی گوڕ و تین و خوێنمان بوو لە بنی دێنا، بە شێوەیەک وامان هەست دەکرد، کە ڕەهێڵ بین و چاو لێک بنێین و ئیتر هەرگیز بێدار نەبینەوە. بەڵام ئێمە توانای نووستنمان نەبوو، نەء هێشتا، ئێمە ویستمان، تا ئەوەندەی لە وزەماندا هەیە، بە خەبەر بین. بەدەم چاوەڕوانیی مردنەوە، دەستمان کرد بە یەکتر دواندن و باسی وڵاتی دوور کردن.

من بابەشامم کەوتەوە یاد و فرمێسک بە چاومدا هاتە خوارەوە. بەڵام برسیەتییەکە هەر ئەو کاتە وا بڕستی لەبەر بڕیبووم، کە فرمێسکەکانیش بەهێواشی بەڕوومدا دەهاتنە خوارێ. یوم-یومیش بە بێدەنگی وەک من دەگریا و چپاندی:

ـ ئەگەر هەر نەبووایە، وڵاتی دووریش هێندە دوورەدەست نەبووایە، ئەگەر دوورگەی سەوزەمێرگان هێندە دوور نەبووایە و ئێمەش ئەوەندە بچووک و تەنیا نەبووینایە.

بیرتە، کاتێ بەسەر گردەکانی سەوزەمێرگاندا دەڕۆیشتین و



شمشاڵمان دەژەند، یوم-یوم، ئەوەت لەبیرە؟
یوم-یوم وتی: ئا، بەڵام ئەوە زۆر لەمێژە.
وتم: ئێمە هەروەها شمشاڵمان لێ دەدا، ئێمە دەبێ ئەو ئاوازە کۆنە لێ بدەین، تا برسییەتی دامان دەگرێ و دەنووین.
یوم-یوم چپاندی: ئا... با جارێکی دیش بیژەنین.
شمشاڵەکانمان دەرهێنا، دەستمان ئەوەندە ماندووبوو بەحاڵ دەیتوانی بیگرێ، بەڵام ئەو ئاوازەمان لێدا. یوم-یوم لە کاتی ژەندنیدا زۆر گریا، کاتێ شمشاڵی لێ دەدا، فرمێسکەکانی ئارام

ئارام بەسەر ڕوومەتیدا دەهاتنە خوارەوە. ڕەنگە منیش هێندەی ئەو گریابم، نازانم، ئەو ئاوازە کۆنە هێندە شیرین بوو، بەڵام ئەویش هێند بە لاوازی دەهاتە دەرەوە، وەکو ئەوەی ئەویش بزانێ زۆر نابا دەمرێ. هەرچەند بە نزمیش دەمانژەند، بەڵام باڵندە سیحرلێکراوەکان گوێیان لێ بوو. ئەوان گوێیان لەو نەغمە لاوازە بوو، پێکڕا هەموو فڕین تا هاتنە بەردەم دەلاقەکەمان. لە دەلاقەکەوە چاوە ڕۆشنە خەمناکەکانیانم دەدی، بەڵام دیسان ونبوونەوە، ئێمەش چیتر توانای شمشاڵلێدانمان نەما.

ـ ئیتر ئێمە بۆ دواجار ژەندمان، من وتم و شمشاڵەکەم خستەوە گیرفانم. بەڵام شتێکی دیش کەوتە گیرفانم، دەستم شۆڕ کردەوە بزانم چییە. ئەوە کەوچکە بچکۆلەکەی جارانی خوشکەکەی یری بوو.

خۆزگەم دەخواست، کە باڵندە سیحرلێکراوەکان بگەڕێنەوە، تا من کەوچکەکەیان نیشان بدەم. ڕەنگە خوشکەکەی یری بیناسێتەوە. بەڵام باڵندە سیحرلێکراوەکان چیتر لە بەردەم دەلاقەکەماندا نەمابوون.

دەستم ئەوەندە ماندوو و بێهێز بوو، کەوچکەکەم لە دەست کەوتە خوارەوە بۆ سەر زەوییەکە.

من وتم: یوم-یوم دەبینی، ئێمە، کەوچکێکمان هەیە.

ـ ڕاستە ئێمە کەوچکێکمان هەیە، بەڵام کە خواردنمان نەبێ چی لە کەوچک بکەین، یوم-یوم وای وت و خۆی دا بە ئەرزدا و چاوی

نوقاند، لە توانایدا نەمابوو هیچی تر بڵێ. منیش هەروەها شەکەت و ماندووبووم، ئەوەندەم برسی بوو، دەمویست شتێ بخۆم، هەرچییەک بێ، بەڕاستی هەرچییەک بێ، بە کەڵکی خواردن بێت، زیاد لە هەموو شتێکیش تامەزرۆی نانی سکی برسی تێرکەرم دەکرد، بەڵام دەمزانی چیدی تامی ناکەم. تینووم بوو، حەزم لە ئاوی ئەو کانییە دەکرد، کە تینویەتی دەشکێنێ، بەڵام دەشمزانی قەت جارێکی دی دەمی لێ تەڕ ناکەم، هەرگیز ئیتر نە دەخۆم و نە دەخۆمەوە. تەنانەت دڵم بۆ لای ئەو شۆربای شیرە چوو، کە بەیانیان پوورە ئێدلا دەیدا پێم و هیچ حەزیشم لێی نەبوو. ئەگەر ئەو شۆربای شیرەش هەبووایە دەمخوارد و بە خۆشم دەزانی. ئای، پیاو هەرچییەک بێ دەستی کەوێت و بیخوا... هەرچییەک بێ! چ هێزێکم تێدا مابوو کۆمکردەوە و کەوچکەکەم خستە دەمم و یاریم پێ دەکرد وەکو ئەوەی پێی بخۆم.

ئەوسا، شتێکی زۆر خۆشم لەدەممدا هەست پێکرد. کەوچکەکە شتێکی تێدا بوو بە کەڵکی خواردن دەهات. شتێک کە لە نانی سکی برسی تێرکەر و ئاوی کانیی تینویەتیشکێن دەچوو. ئەو نان و ئاوەی ناو کەوچکەکە بەلەزەتترین شت بوو من چەشتبێتم. بەتەواوی ژیاندمییەوە و برسیەتییەکەم ڕەوییەوە. ئەوەندەش سەیر بوو کەوچکەکە قەت خاڵی نەدەبۆوە. هەر شتی تازەی تێ دەهات و دەمخوارد، تا ئەوەی چیتر پێم نەخورا.

یوم-یوم بە چاوی نوقاوەوە لەسەر ئەرزەکە کەوتبوو، کەوچکەکەم

کرد بە دەمیدا، ئەو لەوە دەچوو بەدەم خەوەوە شت بخوا، بە چاوی نوقاوییەوە خەریکی خواردن بوو، کە تێر بوو وتی:

ـ ئای، میۆ، خەوێکی چەند خۆشم بینی، خەوێکی وا کە مرۆڤ بەئاسانی بتوانێ بمرێ، من خەوم بە نانی سکی برسی تێرکەرەوە بینی.

من وتم: ئەوە خەو نەبوو.

یوم-یوم چاوی کردەوە و هەستی کرد ژیاوەتەوە و چیتر برسی نییە. ئێمە هەردووکمان سەرمان سوورمابوو لەو نەهامەتییەشدا لە دڵخۆش دەچووین.

یوم-یوم وتی: بەڵام ئەگەر ئێمە لەبرساندا نەمرین، سوارەکاتۆ چیمان لێ دەکا.

وتم: هەر دڵی بەردینمان نەداتێ، تۆقیوم لەوەی دڵی بەردینم هەبێ، پێم وایە دەخزێ لە سنگ و دێشێ.

یوم-یوم وتی: تا شەو نەبڕێتەوە سوارەکاتۆ نایەت، وەرە با دانیشین و باسی وڵاتی دوور بکەین، کە ساتەکان دەڕۆن، با لەپاڵ یەکدا دانیشین بۆ ئەوەی ئەوەندە سەرمامان نەبێ.

زیندانەکە ئەوەندە سارد بوو تەزیبووین، فەرنجییەکەم لەسەر لاچووبوو کەوتبووە سەر ئەرزەکە، هەڵمگرت و لەخۆممەوە پێچا.

ئەوە ئەو فەرنجییە بوو، کە ژنە جۆلاکە بە ڕێس و پارچەی ئەفسانەیی دووریبوویەوە.

لە هەمان کاتدا گوێم لە قیژەی یوم-یوم بوو.

ـ میۆ! میۆ! تۆ لە کوێیت، هاواری کرد.
وتم: لێرەم، لای دەرگاکەم.
یوم-یوم بەو مـۆمـە بچکۆلەیەی دایانبـوو پێـمـان، بۆ ئەوەی دواشـەومـانی پێ ڕۆشن بکەینەوە، دەوروپشـتی خـۆی ڕووناک کردەوە. تیشکی مۆمەکەی دەگرتە هەموو لایەک، زۆریش ترسابوو.
یوم-یوم وتی: - تۆ نابینم، خـۆ کـوێریش نەبووم، چونکە دەرگا و قوفڵە قورسەکە و هەموو شتەکانی زیندانەکە دەبینم.
ئەوسـا زانیم، کـە ئەمـە کـاری فـەرەنجی و پارچەقـومـاشـە ڕێس ئەفسانییەکەی ژنە جۆلاکەیە و، ئەو بەرەی کەوتۆتە ڕووی دەرەوە.
فەرەنجییەکەم لەبەرم داکەند، بۆ ئەوەی بە ڕێکی لەبەری بکەمەوە، دیسانەوە یوم-یوم هاواری کرد.
ـ مەمترسێنە هیچ جارێکی دی، خۆت لە کوێ شاردۆتەوە.
لێم پرسی: من دەبینی؟
یوم-یوم وتی: ئا، ڕاستییەکەی تۆ دەبینم، لە کوێ خۆت شاردبۆوە.
وتم: لە فەرنجییەکەمدا، ژنە جۆلاکە کردوویەتی بە فەرنجییەکی سیـحـراویی نەبینراو. چەند جـارێکمـان تاقی کـردەوە، هەر بەڕاسـتـیش ئەگـەر بەو بەرەیدا لەبەرت کـردایە، کـە بە پارچە ئەفسانەییەکە دوورابۆوە، نەدەبینرا.
ـ با بە هەموو هێزی خۆمان بقیرێنین، ڕەنگە سیخوڕەکان بێن، بزانن ئێـمـە بۆچی هاوار دەکـەین، تۆ ئەو کـاتە دەتوانی بە دزە بەلایاندا بڕۆی. دەتوانی بەو فـەرنجـیـیـە نەبینراوەوە لە قـەلاکـەی

سوارەکاتۆ دەرچیت و خۆت بگەیەنیتەوە وڵاتی دوور.

من وتم: ئەی تۆ یوم-یوم ئەوساکە.

یوم-یوم وتی: من دەبێ بمێنمەوە، دەنگی لەرەی پێ کەوتبوو، چونکە تەنیا تۆ فەرەنجییەکی هەستپێنەکراوت هەیە.

من وتم: - هەروەک تەنیا فەرەنجییەکی نەبینراوم هەیە، ئاوەهاش تەنیا هاورێیەکم هەیە. ئەگەر رێگای رزگاربوونمان نەبێ، دەبێ لەو حاڵەدا هەردووک پێکەوە بمرین.

یوم-یوم باوەشی پێداکردم و وتی:

ـ حەز دەکەم تۆ بڕۆیت و سەری خۆت دەرکەیت و بگەیتەوە وڵاتی دوور. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانم دڵم خۆش نەبێ، ئەگەر لام بمێنیتەوە. من هەوڵ دەدەم مانەوەتم پێ خۆش نەبێ، بەڵام ناتوانم.

هەر لەو وەختەدا ئەمەی وت، شتێکی سەیر روویدا. باڵندە سیحرلێکراوەکان بە شەقەی باڵ هاتنەوە بەر دەلاقەکەمان، بە دەنووکیانەوە شتێکیان هەڵگرتبوو. هەموو باڵندەکان پێکڕا گرتبوویان. شتێکی قورس بوو، شمشێرێک بوو، ئەوە شمشێرەکەی من بوو کە بەردی لەت دەکرد.

یوم-یوم وتی: ئا، میۆ، باڵندە سیحرلێکراوەکان لە قووڵایی زەریاچەی مردووەوە شمشێرەکەیان دەرهێناویتەوە.

ڕامکردە لای دەلاقەکە و دەستە تامەزرۆکانم لە دەلاقەکەوە درێژ کرد و شمشێرەکەم گرت. وەک ئاگر بڵێسەی لێ هەڵدەستا و دڵۆپ دڵۆپ ئاویشی پێدا دەهاتەخوارەوە، دڵۆپە ئاوەکانیش وەک ئاگر دەبریسکانەوە.

من وتم: سوپاس، ئەی باڵندە میهرەبانەکان!
بەڵام باڵندەکان بە چاوە ڕۆشنە خەمناکە باڵندەییەکانیانەوە تێیان ڕوانیم و بە هاواری پڕ لە ناڵەوە بۆ سەر زەریاچەی مردوو فڕینەوە.
ـ ئا، چەند دڵم خۆشە، کە ئێمە شمشاڵمان ژەند، ئەگینا باڵندەکان قەت ڕێگەی زیندانەکەیان نەدەدۆزییەوە.
بەحاڵ گوێم لێی دەبوو. لەوێ بە خۆم و شمشێرەکەی دەستمەوە وەستابووم. شمشێرە بڵێسەی گڕدارەکەم! پێشتر هەستم وا بە بەهێزیی خۆم نەکردبوو، لەمێشکمدا دەنگ و زایەڵە دەهات. بابەشامم بەخەیاڵدا هات و زانیم، کە ئەو بیری لای منە.
ـ ئێستە، ئیتر وەختی شەڕی سوارەکاتۆ هاتووە.
یوم-یوم وا زەردهەڵگەڕا، چاوەکانی وەها سەیر دەبریسکانەوە.
ـ چۆن حەوت قوفڵەکە دەکەیتەوە، چۆن بەلای ئەو حەفتاوحەوت سیخوڕەدا ڕادەبووری؟
وتم: حەوت قوفڵەکە بە شمشێرەکەم دەکەمەوە، فەرەنجییەکەشم لەو حەفتاوحەوت سیخوڕە دەمشارێتەوە. فەرەنجییەکەم دا بەشانمدا، پارچە دووراوە ڕێس ئەفسانەییەکەی لەو تاریکییەدا بریسکەی دەهات، بە شێوەیەک کە لەوەبوو هەموو قەڵاکەی سوارەکاتۆ ڕووناک بکاتەوە. بەڵام یوم-یوم وتی: - تۆ نابینم میۆ، هەرچەند دەشزانم لەوێی، من چاوەڕێت دەکەم تا دێیتەوە.
ـ ئەی ئەگەر قەت سەرم نەهێنایە دواوە، ئەمەم وت و دوایش بێدەنگ بووم. چونکە نەمدەزانی کێ لەو دواشەڕی سوارەکاتۆیەدا سەردەکەوێ.

زیندانەکەمان هێندە بێدەنگ بوو. ساتێکی درێژ هەر بەتەواوی کشومات بوو. دوایی یوم-یوم وتی:

ـ ئەگەر نەشیەیتەوە، میق، دەبێ بیرمان لای یەک بێ. ئێمە دەبێ چەند لە توانامانندا بێ بیرمان لای یەک بێ.

من وتم: ئا، یوم-یوم، من دەبێ لە دواساتدا تۆ و بابەشامم هەر لە بیر بێ.

شمشێرەکەم بەرز کردەوە، دەرگا پۆلایینەکەی وا بڕی وەکو ئەوەی هێلکەیەک بێ. بۆ شمشێرێک بەرد لەت بکا، دەرگا پۆلاییەنەکە وەک هەویر وابوو. هەروەک هەویریش ببڕێ ئاوەها بوو لە کاتی بڕینی پۆلاکەدا دەنگی لێوە نەهات.

بە دوو زەربەی بەهێز و خێرا قوفڵە گەورەکەم دوولەت کرد و فڕێدا. دەوایی دەرگاکەم کردەوە. جیڕەیەکی لێوە هات. حەوت سیخوڕەکەی لەبەردەم دەرگاکەدا نۆبەتیان گرتبوو، کاتێ گوێیان لە جیڕەی دەرگاکە بوو، هەموو ئاوڕیان بەلایدا دایەوە، بەرەو دەرگاکە و بەرەو من. من لە فەرەنجیی پارچەی ڕێسئەفسانەییدا وەستابووم و پێم وابوو شەوقەکەی ئەوەندە بەهێزە، کە هەر دەمبینن.

یەکێک لە سیخوڕەکان وتی: گوێم لە جیڕەیەک بوو لەم شەوەدا.

یەکێکی دییان وتی: ئا، شتێک جیڕەی لێوە هات، لەم شەوەدا. لە هەموو لایەکەوە کەوتنە چاودێری و گەڕان، بەڵام منیان نەدی.

یەکێکی تر لە سیخوڕەکان وتی: ئەوە بیرێکی شەڕاوی سوارەکانتۆ بوو کە جیڕەی هات و بەلاماندا ڕۆی.

بەڵام من زۆر دوورکەوتبوومەوە.

شمشێرەکەم گرتبوو بە دەستمەوە و خۆم لە فەرەنجییەکەدا مەلاسدابوو، زۆر بەخێرایی بەرەو ژوورەکەی سوارەکاتۆ ڕۆیشتم.
لە هەموو شوێنێک، لە هەموو هۆڵ و قات و دالان و شوێنێکدا سیخوڕەکان خەریکی نۆبەتگرتن بوون. ئەو قەلا ڕەشە گەورەیە پڕ بوو لە سیخوڕی ڕەشپۆش. بەلام منیان نەدی. گوێیان لە من نەبوو.
منیش بەخێرایی بەرەو ژوورەکەی سوارەکاتۆ هەڵمەتم دەبرد.
من هیچ ترسێکم لا نەمابوو. قەت ئەوەندە بێ ترس نەبووبووم. چیتر ئەو میۆیە نەبووم، کە لە باخی گوڵانی دوورگەی سەوزەمێرگاندا، خەریکی کوخ و ماقڵە دروستکردن بوو. سوارەیەک بووم ڕێگای جەنگم گرتبووە بەر. بەرەوپێش، بەرەو ژوورەکەی سوارەکاتۆ دەڕۆیشتم.
ئەوەندە بە پەلە و خێرا بەرەوپێشەوە ڕۆیشتم، فەرەنجییە ئەفسانییەکەم لە پشتمەوە کرایەوە و بریسک و هووڕی خستە قەلاکەوە و دەشەکایەوە. بەرەوپێشەوە، بۆ ژوورەکەی سوارەکاتۆ ڕامدەکرد.
شمشێرەکە لەدەستمدا، ئاگرئاسا دەسووتا و شەوق و پڕیشک و هووڕی دەدایەوە. زۆر بەتوندی مشتۆکەیم گرتبوو، بۆ پێشەوە بەرەو ژوورەکەی سوارەکاتۆ بە ڕاکردن چووم.
بیرم لە بابەشام کردەوە، زانیشم ئەو بیر و هۆشی لای منە. هەر ئەوەندە نابا، ها ئێستا تۆزێکی تر، شەڕەکە دەقەومێ. ئەمە نەیدەترساندم، من سوارەیەکی چاونەترسی شمشێر بە دەست

بووم و، بەپرتاویش بەرەو ژوورەکەی سوارەکاتۆ دەرۆیشتم.

لەمێشکمدا هاژەهاژ و هەرایەک بوو، دەتگوت تاڤگەی تێدایە. من ئەوا لەبەردەم دەرگاکەی سوارەکاتۆدا وەستاوم.

دەرگاکەم کردەوە. سوارەکاتۆ لەسەر مێزە بەردینەکەی دانیشتبوو، پشتی لە من بوو. شەڕ و بەلای بە هەر چواردەوریدا پرپشکی دەهاویشت.

ـ وەرگەڕێ، خۆت وەرگێڕە سوارەکاتۆ، من وتم. دواشەڕت هاتووە.

خۆی وەرچەرخاند. فەرنجییەکەم لەبەرم داکەند و بە شمشێرەکەی دەستمەوە ڕووبەڕووی وەستام. ڕووخسارە ترسناکەکەی بۆر و گرژ



بوو، چاوە ترسناکەکانی هەر سام و ڕقیان تێدا بوو. خێرا پەلاماری شمشێری سەر مێزەکەی تەنیشتی دا و هەڵیگرت و، دواشەڕی سوارەکاتۆ دەستی پێکرد.

شمشێرێکی زۆر نالەبار و خەتەری هەبوو، بەڵام باتەقای ئەوەی منی دەکرد. شمشێرەکەم شەوقی دەدایەوە و بریسک و هووڕی بوو، ئەو گڕە بە هەوادا و بێبەزەییانە ئامبازی شمشێرەکەی سوارەکاتۆ بووبوو.

ئەو شەڕەی هەزاران ساڵ بوو چاوەڕێی دەکرا، سەعاتێکی خایاند. ئەو شەڕە بێدەنگە، ترسناک و بەسامە، کە شمشێرەکەمی وەک بڵێسەی ئاگر تیایدا دەچوو بە هەوادا و ئامبازی شمشێرەکەی کاتۆ دەبوویەوە و لەکۆتاییشدا لە دەستی فڕێدا. سوارەکاتۆ بەرانبەرم بێ چەک وەستابوو و، زانی شەڕەکە تەواو بووە.

دوایی کورتەکەکەی سەر سنگی دڕاند.

ـ ئاگادار بە کە یەکسەر بدەی لە دڵم، هاواری کرد. یەکسەر دڵەبەردینەکەم لەت بکەی. ماوەیەکی زۆرە لەناوەوە بە هەڵسووین ئازاری داوم.

دیقەتی ناو چاویم دا. لە چاوەکانیدا شتێکی سەیرم بەدی کرد. لام وابوو، سوارەکاتۆ حەزی دەکرد، کە ئەو دڵە بەردینەی لە کۆڵ بێتەوە. ڕەنگە وابێ، کەس ئەوەندەی سوارەکاتۆ خۆی ڕقی لە خۆی نەبووبێ.

زۆر چاوەڕێم نەکرد. شمشێرە ئاگرینەکەم بەرزکردەوە و، ئەوەندەی توانیم دامهێنایەوە و تا قووڵایی دڵە بەردینەکەی سوارەکاتۆم چەقاند.

لەو چاوتروکاندنەدا سوارەکاتۆ ونبوو. لەناو ژوورەکەیدا کۆمەڵەبەردێ مابۆوە. کۆمەڵە بەردێک و چنگێکی پۆلایین.

لە پەنجەرەی ژوورەکەی سوارەکاتۆدا، تەیرێکی بۆری بچکۆلە هەڵنیشتبوو، دەنووکی دەدا لە شووشەکە. دەیویست بڕواتە دەرەوە. پێشتر ئەو تەیرەم نەدیبوو، نازانم لەکوێدا خۆی حەشار دابوو. بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشتم و کردمەوە، بۆ ئەوەی تەیرەکە بتوانێ بفڕێ. لەگەڵ کردنەوەی پەنجەرەکەدا و خۆی هاویشتە حەوا و دای لە شەقەی باڵ، جریواندی و زۆر شادمان بوو.

من لای پەنجەرەکەدا وەستام و بینیم چۆن تەیرەکە فڕی، بینیشم کە شەو بڕاوەتەوە و بەیانی داوە.



# میۆ، میۆکەی من

بەیانی دابوو. ئاووهەواش ئەوەندە خۆش بوو. هەتاو کەوتبوو، کاتێ لای پەنجەرەکەدا وەستابووم، شنەی نەرم و نیانی هاوینە دەهات و یاریی بە قژم دەکرد. چوومە دەرەوە سەیری زەریاچەکەی خوارەوەم کرد. بووبووە زەریاچەیەکی بچکۆلەی شین و شاد، کە ڕۆژ خۆیی تێدا دەبینی، باڵندە سیحرلێکراوەکانی لێ نەمابوو.

ڕۆژێکی ئاوا خۆش، هەر بەڕاستی ڕۆژی یاریکردنە.

سەیری ئاوەکەی خوارەوەم کرد، چۆن خۆی بۆ بای بەیانی پێچ دەدا. حەزم دەکرد شتێک فڕێ بدەمە زەریاچەکە، پیاو لە کاتی ئاو بینیندا ئەمەی بەخەیاڵدا دێ. بیر بکەوە، ئاخۆ چ زرمەیەکی دەبێ ئەگەر پیاو لە بەرزاییەکی ئاواوە شتێ فڕێ بداَ. هیچیشم پێ نەبوو، جگە لە شمشێرەکەم، کە فڕێی بدەم، واشم کرد کە بکەوێتە خوارەوە. کە لە حەوادا بەرەوخوار دەبوویەوە ئەوەندە خۆش بوو. کە کەوتە ئاوەکەوە کردی بە شڵپ و هووڕ. کاتێ شمشێرەکە ڕۆچوو و ونبوو، سەر ڕووی ئاوەکە بووبووە ئەڵقەی بلقی گەورە گەورە. ئەڵقەکانی سەر ئاوەکە تا دەهات گەورەتر دەبوون و بەسەر هەموو زەریاچەکەدا بڵاو دەبوونەوە. شتێکی زۆر خۆش بوو.

بەلام من وەختی ئەوەم نەبوو، ئەوەندە چاوەڕێ بکەم تا ئەڵقەکان دەڕەوێنەوە و ون دەبن. من دەبێ خێرا بکەم بۆ لای یوم-یوم، دەمزانی ئەو بێ ئارامە و چاوەڕێم دەکات.

بە هەمان ئەو ڕێگایەدا پێش سەعاتێ گرتبووم، گەڕامەوە. ئەو هۆڵە گەورە و دالانە درێژانە چۆڵ و هۆڵ و کشومات بوون. تاقە سیخوڕێکی ڕەشپۆش چییە لەوێ نەمابوو. هەموو ون بووبوون، لەو هۆڵە خاڵییانەدا تیشکی ڕۆژ دەبریسکایەوە. لە دەلاقەکەوە تیشکی دەدا لە ماڵە جاڵجاڵۆکەی شۆڕبووەوەی بنمیچی تاقەکان، پیاو دەیبینی چ قەڵایەکی کۆن و ڕزیوە.

لە هەموو لایەکەوە هەر کشوماتی و بێدەنگی بوو، لەپڕدا دڵم داخوریا، بڵێی یوم-یومیش لەوێ نەمابێ. بەخێرایی ڕامکرد، بەرەوپێشەوە ڕۆیشتم. کاتێ لە زیندانەکە نزیک کەوتمەوە، گوێم لێ بوو یوم-یوم شمشاڵی لێ دەدا، دوایی ئارام و دڵشاد بووم.

دەرگای زیندانەکەمانم کردەوە، یوم-یوم لە ئەرزەکەیدا دانیشتبوو. کاتێ چاوی بە من کەوت، چاوەکانی دەستیان بە درەوشانەوە کرد، ڕایکرد و وتی: - ناچار بووم هەموو وەختەکە شمشاڵ بژەنم، چونکە دڵم زۆر لەمەراقدا بوو.

من وتم: چیتر پێویست ناکات بێ ئارام بی.

من و یوم-یوم ئەوەندە دڵخۆش بووین، هەر سەیری یەکترمان دەکرد و قاقای پێکەنینمان بوو.

- ئێستە لێرە دەڕۆین، من وتم. دەڕۆین و هەرگیز نایەینەوە بۆی. دەستی یەکترمان گرت و بەڕاکردن لە قەڵاکەی سوارەکاتۆ چووینە دەرەوە. لە باخچەی قەڵاکەدا ڕامان دەکرد. کێ بە غار بەرەو ڕووم بێ باشە، جگە لە میرامیس، میرامیسە یاڵزێڕینەکەم! نۆمایەکی بچکۆلەش بەغار لەگەڵیدا دەهات.



میرامیس ڕاست بەرەو لام هات، باوەشم کرد بە ملیدا و ماوەیەکی زۆر سەرم نا بە سەریەوە و چپاندم بەگوێیدا:

ـ میرامیس، میرامیسەکەی خۆم!

میرامیس بە چاوە بەوەفاکانییەوە سەیری کردم، زانیم، کە چەندێ من غەریبی و بیری ئەوم کردووە، ئەویش هێندە.

لە ناوەڕاستی باخەکەدا مێخ و زنجیرێک هەبوو. دوایی بۆم دەرکەوت، کە سیحر لە میرامیسیش کرابوو، ئەو ئەو ئەو ئەسپە ڕەشە بوو، کە لە باخی قەڵاکەدا بەسترابۆوە. ئەو نۆمایەش، هەر ئەوە

بوو، کە سوارەکاتۆ لە دارستانە تاریکەکەوە فڕاندبووی. هەر بۆ ئەم نۆما بچکۆلەیەش بوو، سەد ئەسپەکە فرمێسکی خوێنیان دەڕژاند. ئیتر پێویست ناکات بگرین، ئەوان هێندە نابا بە نۆماکە شاددەبنەوە.

یوم-یوم وتی: بەڵام ئەی ئەوانەی دی، کە هەر سوارەکاتۆ فڕاندبوونی، ئەی باڵندە سیحرلێکراوەکان بۆ کوێ چوون؟

وتم: با بەسواری بچینە خوارەوە بۆ سەر زەریاچەکە و بەدوایاندا بگەڕێین.

ئێمە خۆمان هەڵدایە سەرپشتی میرامیس و نۆما بچکۆلەکەش بەدوامانداندا تا هێزی تێدا بوو، غاری دەدا. لە دەروازەی قەڵاکە چووینە دەرەوە.

لە هەمان ساتدا شتێکی سەیر و ترسناکمان گوێ لێ بوو. گوێمان لە گرمەیەک بوو لەدوامانەوە، کە هەموو زەمینی هێنابووە لەرەولەرزە. ئەوە قەڵاکەی سوارەکاتۆ بوو، کە داڕما و تەنیا کەڵەکە بەردێکی لە پاش بەجێ ما، نە بورج و، نە هۆڵە خاڵییەکان و پەنجەرە شیش ئاسنەکان و قادرمە پێچپێچەکانی، هیچ هەر هیچی نەما، ئەوەی لێی مایەوە، تەنیا کەڵەکە بەردێکی گەورە بوو.

یوم-یوم وتی: چیتر قەڵاکەی سوارەکاتۆ وجودی نییە.

من وتم: نەء، جگە لە بەرد هیچی لێ نەماوەتەوە.

لە تاشی لای قەڵاکەوە، ڕێچکەیەک بەرەو زەریاچەکە شۆڕ دەبوویەوە. ڕێچکەیەکی خز و باریک و ترسناک. بەڵام میرامیس

هێند بە پارێز و وریایی و جـــوانی دەڕۆی، هەروەهاش نۆمـــا بچکۆلەکە، کە ئێمە بە ساغ و سەلامەتی گەیشتینە کەنارەکە.

هەر لە دامێنی تاشی قەڵاکەدا، لەسەر تاوێرێک ڕیزە منداڵێک وەستابوون. ئەوان چاوەڕێی ئێمە بوون، بەرەو ڕوومان هاتن و ڕوویان لە خۆشیدا دەگەشایەوە.

ئا، ئەوە براکەی نوونووە، یوم-یوم وتی. ئەوە خوشکە بچکۆلەکەی یری و هەموو ئەوانی دین. چیتر باڵندەی سیحرلێکراو نەماوە.

ئێمە لە میرامیس دابەزین. هەموو منداڵەکان بەرەو ڕوومان هاتن، تۆزێ شەرمن دیار بوون، بەڵام هەموو زیکەلە و ئێسکسووک و ڕووخۆش بوون. کوڕێک، یەکێک لە براکانی نوونوو دەستی گرتم و بە دەنگێکی نزم، وەکو ئەوەی نەیەوێ کەس گوێی لێ بێ، وتی:

ـ من زۆر کامەرانم کە فەرنجییەکەی منت لەبەردایە و زۆریش شادم کە چیتر ئێمە سیحرلێکراو نین.

کچێکیش کە خوشکی یری بوو، هاتە پێشەوە، سەیری منی نەدەکرد، سەیری زەریاچەکەی دەکرد، چونکە زۆر شەرمن بوو، ئەویش هەر بە دەنگێکی نزم وتی:

ـ من زۆرم پێ خۆشە، کەوچکەکەم کەوتۆتە لای تۆ. زۆریش خۆشحاڵم کە ئیتر کاری سیحرمان لەسەر نەماوە.

براکەی تری نوونووۆ دەستی خستە سەر شانم و وتی:

ـ زۆر دڵخۆش بووم بەوەی توانیمان شمشێرەکە لەو قووڵاییەوە بهێنینە دەرەوە. هەروەها بەوەش کە چیتر ئێمە سیحرلێکراو نین.



منداڵەکان بەرەو ڕوومان هاتن، ڕوویان لەخۆشیدا دەگەشایەوە.

من وتم: بەڵام دیسانەوە، ئێستە شمشێرەکە لە بنی زەریاچەکەدایە.
ئەوەش زۆر باشە، چونکە چیتر پێویستمان بە شمشێر نابێ.
ـ نەء، ئێمەش ئیتر ناتوانین دەری بهێنینەوە، چونکە ئیتر ئێمەش بە سیحر بەباڵندەکراوەکەی جاران نین.
بە دەوری خۆمدا سەیری هەموو منداڵەکانم کرد ی پرسیم:
ـ کێتان کچە بچکۆلەی ژنە جۆلاکەیە؟
کشوماتی بوو، کەس هیچی نەگوت.
ـ کێ کچە بچکۆلەی ژنە جۆلاکەیە، جارێکی دی پرسیم، چونکە حەز دەکەم پێی بڵێم کە فەرنجییەکەم بە ڕێسێ دووراوەتەوە کە هی دایکی ئەوە.



براکەی نوونوو وتی: میلیمانی کچە بچکۆلەی ژنەجۆلاکە بوو.
پرسیم: ئەی لە کوێیە؟
براکەی نوونوو وتی: میلیمانی لەوێیە. منداڵەکان کشانە دواوە.
زۆر لە خوارەوە، لە کەناری ئاوەکەدا بەسەر تاوێرێکەوە ڕاکشابوو.
بەرەو لای ڕامکرد و لەبەردەمیدا هاتم بە چۆکدا. بێ جووڵە، بە چاوی نوقاوەوە ڕاکشابوو، مردبوو. سیمای ئەوەندە سپی و بچکۆلە بوو، لاشەی بەتەواوی سووتابوو.
براکەی نوونوو وتی: ئەو بەرەو ڕووی بڵێسەی ئاگرەکە فڕی.
خەم دایگرتم، چونکە میلیمانی لە پێناوی مندا مردبوو، گیانی بەخشیبوو. خەمەکەم ئەوەندە قورس بوو، هیچ شتێ دڵی خۆش نەدەکردم. خەمی ئەوەی میلیمانی لە پێناوی مندا خۆی دابوو بە کوشت.
ـ دڵگران مەبە، میلیمانی خۆی ئەوەی ویست، براکەی نوونوو وتی. خۆی ویستی بەرەو ئاگرەکە بفڕێ، هەرچەندە دەشیزانی باڵەکانی گڕیان تێ بەر دەبێ.
ـ ئەو ئیتر ئێستە مردووە، من وتم و ئەوەندە خەمباربووم.
براکەی نوونوو دەستە بچکۆلە سووتاوەکانی میلیمانی خستە ناو دەستی خۆی.
ئەو وتی: میلیمانی، پێویستە لێرە تۆ بەجێ بهێڵین، بەڵام پێش ئەوەی بڕۆین، دەبێ گۆرانییەکەمانت بۆ بڵێین.
منداڵەکان هەموو لەسەر تاوێرەکە دەوریان لە میلیمانی دا و

گۆرانییان بۆ گوت، ئەو گۆرانییەی خۆیان دایاننابوو.

*میلیمانی، خوشکە بچکۆلەکەمان،*
*خوشکە بچکۆلەکەمان کە لە شەپۆلدا نوقم بوو،*
*بە باڵە سووتاوەکانییەوە، نوقمی شەپۆلەکان بوو،*
*میلیمانی، هۆ، میلیمانی.*
*بێ جووڵە نووستووە و هەرگیز بێدار نابێتەوە،*
*چیتر و هەرگیز میلیمانی بە قیژەی خەمناکەوە،*
*بەسەر ئاوە ڕەشەکەدا نافڕێ.*

یوم-یوم وتی: نەء، چونکە چیتر ئاوی ڕەش نەماوە.

تەنیا شەپۆلی میهرەبانی بچووک بچووک هەن، کە گۆرانی بۆ میلیمانی دەڵێن، کاتێ ئەو لە کەنارەکەدا ڕاکشاوە و نووستووە.

خوشکەکەی یری وتی: هیچ نەبێ، شتێکمان هەبووایە لێمانەوە بیپێچایە، شتێکی نەرم بۆ ئەوەی لەسەر ئەو تاوێرە ڕەقە نەبێ.

من وتم: فەرەنجییەکەی منی لێوە دەپێچین، ئەو فەرەنجییەی دایکی بە ڕێسەکەی دووریویەتەوە.

میلیمانیم بەو فەرەنجییەی بە ڕێسی ئەفسانەیی دوورابۆوە پێچایەوە، کە لە گوڵەسێو نەرمتر و لە بای شەوانەی ناو گیا نیانتر و لە خوێنی سووری دڵ گەرمتر بوو، بە دەستی دایکی خۆشی دوورابووەوە. زۆر بە پارێزەوە فەرەنجییەکەم لەو میلیمانییە گوناحەوە پێچا، بۆ ئەوەی تاوێرەکەی بۆ ببێ بە نەرمایی.

ئەو کاتە شتێکی یەکجار خۆش ڕووی دا. میلیمانی چاوەکانی

کردەوە و بە منیدا ڕوانی. لەپێشدا بێ جووڵە ڕاکشابوو، پێیدا دەڕوانیم. دوایی ڕاستبوویەوە و بە منداڵەکانیدا ڕوانی، وا سەری سووڕمابوو. سەیری دەوروپشتی خۆی دەکرد و ڕووخساری زیاتر ڕامانی تێدا دەردەکەوت.

وتی: زەریاچەکە چەند شینە.

تەنیا ئەوەندەی وت. دوایی فەرەنجییەکەی لە خۆی کردەوە و هەستایە سەر پێ، هیچ جێیەکی سووتاوی پێوە دیار نەبوو، ئێمەش زۆر پێخۆشحاڵ بووین، کە ئەو زیندووبوویەوە.

لەو دوورەوە بەلەمێک دەهات، کەسێک بەتوندی سەوڵی لێ دەدا.

کاتێ بەلەمەکە نزیکبوویەوە، بینیم، کە شمشێرەسازەکەیە بە سەوڵلێدان دێت، ئێنۆشی لەگەڵ خۆی هێنابوو.

بەلەمەکەیان یەکسەر لای تاوێرەکەدا لەنگەری گرت و دابەزینە سەر زەوی.

شمشێرسازەکە بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:

ـ چیم وت، هەر زوو دواشەڕی سوارەکاتۆ ڕوودەدا.

ئێنۆ بەتاسەوە لێم هاتە پێشەوە و وتی: من تەنیا دەمەوێ شتێکت نیشان بدەم، میرمیۆ.

دەستە چرچ و لۆچەکانی هێنایە پێشەوە و نیشانی دا کە چی تێدایە. گەڵایەکی سەوزی بچکۆلە بوو. گەڵایەکی بچکۆلە و جوان، تەنک و نەرم، سەوزێکی زۆر کاڵ بوو، ڕەگە باریکەکانی جوان دیار بوون. ئێنۆ وتی:

ـ ئەمە لە دارستانی مردوودا سەوزبووە. من ئەمەم تۆزێ لەمەوبەر لە دارستانی مردوودا دۆزییەوە.

زۆر بە کەیف و خۆشییەوە سەری بادەدا، کەللە بچکۆلە بژە بۆزەکەی لەقەلەقی بوو و وتی:

ـ من دەبێ ئیتر هەموو بەیانییەک بچمە دارستانی مردوو، ببینم ئاخۆ گەڵای زۆرتری کردووە. ئەمە با بۆ تۆ بێ میرمیۆ!

کە گەڵاکەی خستە ناو دەستم، لای وابوو جوانترین شتی دنیا دەبەخشێ.

دوایی جارێکی دی، سەری بادا و وتی: دانیشتم و نزام کرد، کە خێر بێتە ڕێگات، میرمیۆ! لە کوخەکەمدا لەو دوورەوە دەست بە دوعای خێرەوە دانیشتبووم، نزام دەکرد چاکە بێتە ڕێت.

شمشێرسازەکە وتی: چیم وت، زوو دواشەڕی سوارەکاتۆ دێ، من وتم.

لە شمشێرسازەکەم پرسی: چۆن بەلەمەکەتت دەست کەوتەوە؟

شمشێرەسازەکە وتی: شەپۆلەکان بەسەر زەریاچەکەدا هێنایانەوە.

بەسەر زەریاچەکەدا سەیری چیای شمشێرسازەکە و کوخەکەی ئێنۆم کرد. بینیم کە چەند بەلەمێک دەهاتن. چەند بەلەمێک لە ئاوەکەدا بوون، خەڵکێکیان تێدابوو، کە من نەمدەناسین. کەسانێکی ڕەنگزەرد و بچکۆلە و سەیری هەتاو و زەریاچە شینەکەیان دەکرد و ئەوەندە ڕووخۆش و شاگەشکەکردوو دیار بوون. ڕەنگە ئەوان پێشتر قەت هەتاویان نەدیبێ، هەتاوێکی بریسکەدار، زەریاچەکەش

وەها ڕوون بوو بەسەر تاشی چیاکان و دەوروبەردا، ئەو ناوە ئەوەندە شیرین و جوان بوو، نەبێتەوە. تەنیا کەڵەکە بەردە گەورەکەی کەژی قەڵاکە جوان نەبوو. بەڵام من بیرم بۆ ئەوە چوو، کە ڕەنگە وەختێ بێ، گیای ڕەقەنی لەسەر کەڵەکە بەردەکە بڕوێ. جارێ، ڕۆژگارێ، دەکەوێتە ژێر گیایەکی نەرمی سەوزەوە و قەڵاکەی سوارەکاتۆش لەژێریدا دەشاردرێتەوە و کەس پێی نازانێ.

من جۆرە گوڵێکی پەمەییم دیوە، کە چاک لەناو ئەو گیایەدا دەڕوێ. لە زەنگی بچووک دەچێ و بە ڕیزی درێژ شین دەبێ. ڕەنگە وەختانێک بێت ئەم جۆرە گوڵە پەمەییانە لەناو گیاکەی سەر قەڵاکەی سوارەکاتۆدا بڕوێن. ڕەنگە زۆر جوان بن.

ڕێگای گەڕانەوە بۆ ماڵەوە دوور بوو، بەڵام بڕینی ئاسان بوو. منداڵە بچکۆلەکان بە سواری میرامیس، هەرە بچکۆلەکانیش بە سواری نۆماکە ڕۆیشتن. پێیان خۆش بوو. تا دارستانە تاریکەکە، ئێمە، بە پێ ڕۆیشتین.

شەو داهاتبوو، دارستانی تاریکیش وەک جاران مانگەشەوی لێ هەڵهاتبوو. کاتێ بەناو درەختەکاندا دەڕۆیشتین، تەواو کشومات بوو. بەڵام میرامیس بە شێوەیەکی وا بەرز دەیحیلاند کە سەد ئەسپە سپییەکە بە هەمان شێوە وەڵامیان دەدایەوە. بەغار بەرەو لای ئێمە هاتن، زرمەی سمیان زەوییەکەی دەلەرزاند. نۆما بچکۆلەکەش دەستی کرد بە حیلاندن. ئەویش دەیویست ئەسپ ئاسا بەرز بحیلێنێ، بەڵام هەر حیلەیەکی نزم و نیخنی لێوە دەهات

و بەحاڵ دەبیسترا. بەهەرحاڵ، حیلەی سەد ئەسپە سپییەکە چاک دەبیسترا. ئەوان دڵخۆش بوون بەوەی کە نۆماکە گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە! هەموو بە پاڵەپەستۆ، بەدەوریدا، خڕبوونەوە، دەیانویست لێی نزیک ببنەوە و خۆیانی لێ بدەن، بۆ ئەوەی دڵنیا بن کە خۆیەتی وا گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە. ئێمە سەد ئەسپمان هەبوو، پێویست نەبوو چیتر کەس پیادە بێ. هەر منداڵە و ئەسپی خۆی دەست کەوت سواری ببێ. من خۆم سواری میرامیس بووم، هەروەک جارانیش یوم-یومم خستە پاشکۆم، چونکە ئەو جگە لە میرامیس



نەیدەویست سواری هیچ ئەسپێکی دی ببێ. هەرە بچکۆلەترین کچیش سواری نۆماکە بوو.

بەسواری بەناو دارستانەکەدا دەڕۆیشتین، سەد ئەسپە سپییەکەش هێند لەبەر مانگەشەوەکەدا جوان بوون.

من زوو لەنێوانی درەختەکاندا ڕووناکییەکی سپیم دی. ئەوە گوڵەسێوی دەوری ماڵی ژنەجۆلاکە بوو. گوڵی سپیی داری سێو دەوری ماڵەکەی داپۆشیبوو، هەر لە خانووی ڕازە ئەفسانەییەکان دەچوو. گوێمان لە دەنگێک بوو لەژوورەوە دەهات، میلیمانی وتی: ئەوە دایکمە جۆلایی دەکا.



لە دەروازەکەدا لە ئەسپەکە دابەزییە خوارەوە، دەستی بۆ ڕاوەشاندین و وتی: زۆر دڵم خۆشە بەوەی گەڕامەوە ماڵەوە، دڵشادم بەوەی گەڕامەوە پێش ئەوەی گوڵەکان ببنە سێو.

بە ڕێچکەی بچکۆلەی نێوان دارسێوەکاندا ڕایکرد و لە خانووەکەدا لە چاو ونبوو. ئیتر ژنەجۆلاکە دەستی لە کارەکەی هەڵگرت.

ئێمە ڕێگایەکی دوورودرێژی دوورگەی سەوزەمێرگانمان لە پێش بوو، من غەریبیی ئەوێ و بابەشامم دەکرد. میرامیسیش سەرڕەوی ئەو سەد ئەسپە سپییە بوو، دارستانە تاریکەکەیان دەبڕی و بە شاخەکاندا ڕووە و هەوراز و بەرزی، بەناو هەوادا بەرەو دوورگەی سەوزەمێرگان دەفڕین.

بەیانی بوو کە گەیشتینە سەر پردی تیشکی بەیانیان. پاسەوانەکان تازە پردەکەیان دانابوو، لە تیشکی زێڕین و ڕووناکیدا دەدرەوشایەوە، کاتێ ئەو سەد ئەسپە بەسەریدا، بە گەردنی بەرز و بەرەوپێشەوە تاویان دەدا و باڵیان لەبادا دەشەکایەوە. پاسەوانەکان حەپەسابوون و هەر لە ئێمەیان دەڕوانی. لەپڕا یەکێکیان کەڕەنایەکی دەرهێنا و فووی پێدا کرد، بەسەر دوورگەی سەوزەمێرگاندا دەنگی دەدایەوە و زایەڵەی دەهات. لە هەموو خانووە بچکۆلەکان و کوختەکانەوە بەڕاکردن هاتن، ئەوانەی خەمبار و تلاوەی دەردی منداڵە فڕێنراوەکانیان بوون. ئێستە ئەوان بە سواری ئەسپە سپییەکان بەغار دێنەوە و کەسێکیشیان لێ نوقسان نییە. هەموویان، هەر هەموویان گەڕاونەتەوە بۆ ماڵەوە.

ئەو ئەسپە سپییانە بەتاو بەسەر مێرگەکاندا دەڕۆیشتن، زۆری نەبرد گەیشتینە باخی گوڵانی بابەشام. منداڵەکان هەموو دابەزین، دایک و باوکیان بەڕاکردن هاتن، هەر لەو سەد ئەسپە سپییە دەچوون، کە کاتێ نۆما بچکۆلەکەیان دی گەڕاوەتەوەماڵەوە. نوونووو داپیرەی، یری و خوشک و براکانی، دایک و باوکی یوم-یوم و خەڵکێکی زۆری تریش کە قەت نەمدیبوون، ئەوان دەگریان و پێدەکەنین و باوەشیان بەو منداڵانەدا دەکرد کە گەڕابوونەوە بۆ ماڵەوە و ماچیان دەکردن.

بەڵام بابەشام لەوێ نەبوو.

سەد ئەسپەکەمان چیتر پێویست نەبوو، دوایی گەڕانەوە بۆ دارستانە تاریکەکە. من دیمن چۆن بەسەر مێرگەکاندا بەغار شەقاویان دەنا. لە پێش هەمووشیانەوە نۆما سپییە بچکۆلەکە بەتاو دەڕۆیشت.

یوم-یوم لە نووکەوە چیمان بەسەرهاتبوو بۆ دایک و باوکی گێڕایەوە، ئاگای لێ نەبوو من دەروازەی باخی گوڵانم خستە سەر پشت. کەس هەستی پێ نەکرد چۆن لە باخی گوڵاندا ونبووم، زۆر چاکیش بوو. چونکە دەمویست بەتەنیا بڕۆم. بە ژێر دار سپیچنارەکاندا ڕۆیشتم، هەروەک جاران لەرە و لەرزەیان بوو، گوڵەباخەکان وەک جاران کرابوونەوە، هەموو شتێ هەر لە جێی خۆی و وەک خۆی وابوو.

ئەوسا من بینیم، بابەشامم دی. لە هەمان شوێن وەستابوو کە من بەجێمهێڵا، کاتێ بەرەو دارستانە تاریکەکە و بۆ وڵاتەکەی نزیکمان



کەوتمە ڕێ. لەوێ وەستابوو، باسکی بۆ واڵاکردمەوە، منیش خۆم فڕێدایە باوەشی و توند توند باوەشم کرد بە ملیدا، ئەویش گوشاردمی بەخۆیەوە و چپاندی:

ـ میۆ، میۆکەی من!

چونکە بابەشام منی زۆر خۆش دەوێ و منیش ئەو.

هەموو ڕۆژەکەم زۆر بەخۆشی بردە سەر. ئێمە لە باخی گوڵاندا یاریمان کرد، من و یوم-یوم، نوونتوو و براکانی و یری و خوشک و براکانی و هەموو منداڵەکانی تریش. ئەوان سەیری ئەو کوختەیان

کرد، کە من و یوم-یوم کردبوومان و زۆر لایان جوان بوو. غارمان بە میرامیسیش کرد، ئەو بەسەر گوڵەباخەکاندا بازی دەدا، یاریمان بە فەرەنجییەکەشم کرد، چونکە براکەی نوونئوو دای پێم بۆ خۆم و نەیویستەوە، ئەو وتی: بەهەرحاڵ، بۆ تۆ دووراوەتەوە میۆ.

یاریی چاوشارکێمان بە فەرەنجییەکە کرد. من بە دیوی دوورینەوەکەدا لەبەرم دەکرد و بەناو تەلانی گوڵەکاندا لەو ناوەدا دەسووڕامەوە و هاوارم دەکرد و کەس نەیدەدیم:

ـ کەس ناتوانێ بمگرێ، کەس ناتوانێ بمگرێ!

هەرچەندە هەوڵیشیان دەدا، بەلام بۆیان نەدەگیرام.

کاتێ تاریک دادێ، هەموو منداڵەکان دەبێ بچنەوە بۆ ماڵەوە.

دایک و باوکەکانیان نەیاندەویست، کە ئەوان زۆر لە دەرەوە بن، چونکە ئەوە یەکەم ئێوارەی گەڕانەوەیان بوو بۆ ماڵەوە.

یوم-یوم و من لە کوختەکەماندا مابووینەوە. کە تاریکی سەر باخی گولانی داگرت ئێمە شمشاڵمان لێ دەدا.

ـ دەبێ ئاگامان لە شمشاڵەکانمان بێ، یوم-یوم وتی. ئەگەر جارێک لە جاران لە یەکدی ون بووین، دەبێ ئەو ئاوازە کۆنە بژەنین.

هەر ئەو حەلە بابەشام هات بەدوامدا بمباتەوە. من بە یوم-یومم وت شەوباش و ئەو ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان. شەوباشیشم لە میرامیس کرد کە لە گیای تەنیشت کوختەکەدا دەلەوەڕا. دەستی بابەشامم گرت و بەناو باخی گولاندا بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتینەوە.

ـ میۆ، میۆکەم، تۆ ئەم ماوەیەی کە لە ماڵ بڕابووی، گەورە بووی،

من لام وایه، ئەم ئێوارەیە خەتێکی تازە لە دەرگای موبەقەکە دەکێشین.
بە ژێر دارچنارەکاندا دەڕۆیشتین، تاریک و لێلی ئێوارە لە دووکەڵێکی تەنکی شین دەچوو بەسەر باخی گولانەوە. باڵندە سپییەکان خۆیان لە هێلانەکانیاندا کڕکردبوو. بە چڵەپۆپەی بەرزترین چنارەوە، باڵندەی خەم هەڵنیشتبوو و تاق و تەنیا دەیخوێند. نەمزانی ئێستە بە بالای کێدا دەخوێنێ، کە هەموو منداڵە فڕێنراوەکان گەڕاونەتەوە ماڵەوە، بەڵام بیریشم کردەوە، کە باڵندەی خەم هەمیشە شتێکی هەیە بۆی بخوێنێ.
لە مێرگە دوورەکاندا شوانەکان دەستیان کرد بە ئاگرکردنەوە. یەک لەدوای یەک، بڵێسەیان بەرزدەبوویەوە، ئەوەندە جوان لەو تاریک و لێڵەدا دەگڕان. گوێم لێ بوو لەو دوورەوە شوانەکان شمشاڵیان دەژەند، ئاوازە کۆنەکەیان لێ دەدا.
من و بابەشام قۆڵمان کردبوو بە قۆڵی یەکدا و دەستی یەکدیمان گرتبوو و دەڕۆیشتین. بابەشام پێیدا ڕوانیم و نەرمە پێکەنینێکی بۆ کرد و منیش لێم ڕوانی و زۆر دڵم خۆش بوو.
بابەشام وتی: میۆ، میۆکەی من.
چیتریش نا.
ـ میۆ، میۆکەم، کاتێ لەو دەمەدەمی ئێوارەیەدا بەرەو ماڵ دەبووینەوە، دوایی ئێوارە بوو، شەو داهات.
ڕاستییەکەی ئەوە ماوەیەکی زۆرە من لەم وڵاتی دوورەم. کەم بیر

لەو کاتانە دەکەمەوە، کە لە ئوپلاندسگاتان دەژیام. جارویار بێنکام دێ بە بیـــردا، چونکە ئەو زۆر لە یوم-یوم دەچێ، هیـــوادارم کـــە بێنکاش زۆر بیری من نەکات. لەبەر ئەوەی کەس وەک من نازانێ بیرکردن چەند سەختە. بەهەرحاڵ، بێنکا باوک و دایکی هەیە و ئومێدمە چاکترین هاورێشی پەیداکردبێ.

جاری واش هەیە، کە بیر لە پووره ئێدلا و مام سیکستن دەکەمەوە. ئێستە هیچ رقم لێیان نابێتەوە، بەس مەبەستمە بزانم، دەبێ چییان وتبێ کـە من ونبـووم، هیچ بە دەربەسـتی منەوە هاتبن، یان هەر بەخەیاڵیشیاندا نەهاتبێ و هەستیان نەکردبێ، کە من ونبووم. پووره ئێدلا، رەنگە لای وابێ، ئەگەر بچێتە تێگنێرلوند و چاوێ بگێرێ، لەسەر کورسییەک بمدۆزێتەوە. رەنگە پێی وابێ، لەسەر کورسییەکە لەژێر گڵۆپێکدا دانیشتووم و خەریکی سێوخواردنم و یاری بە شووشەیەکی بەتاڵ، یان بە شتێکی فرێدراو دەکەم. رەنگە پێی وابێ، دانیشتووم و سەیری خانووەکانی سەرەوە دەکەم، کە پەنجەرەکانی رۆشنن و منداڵان لەگەڵ دایک و باوکیاندا نانی نێوەرۆ دەخۆن. یان رەنگە پووره ئێدلا لای وابێ و لەوە توورە بووبێ کە من هەرگیز نایەمەوە بۆ ماڵ و چۆرەکەکەی بۆ ناهێنمەوە.

بەڵام پووره ئێدلا بە هەڵەدا چووە. ئا، ئەو لەچیدا هەڵەیە! چونکە چ بووسەیەک لە تێگنێرلوند لەسەر کورسییەک دانەنیشتووە. چونکە ئەو لە وڵاتی دوورە. ئەو لە وڵاتی دووره من دەڵێم. ئەو لەو شوێنەیە کە گەڵای چنارەکان لەرە و لەرزەیانە... لەوێ کە ئاگر دەگرێ و

شەوان گەرم دەکاتەوە. لەوێ کە نانی سکی برسی تێرکەر هەیە...
لەوێ کە ئەو بابەشای هەیە و زۆر یەکتریان خۆش دەوێ.
ئا، ئە ئاوایە. بو ڤیلهێلم ئولسۆن لە ولآتی دوورە و ئەوەندە
خۆشییەتی، لای بابەپاشای.



# ئەسترید لیندگرێن

سالّی ١٩٠٧ لە دایک بووە. یەکێکە لە نووسەرە هەرە دیارەکانی سوید. زۆربەی خەڵک ئاشنای بەرهەمەکانین و وەریشگێڕدراونەتە سەر نزیکەی شەست زمان. سالّی ١٩٤٥، چیرۆکی (پیپی گۆرەویدرێژ)ی نووسی، هەرچەندە هەندێ کەس لەسەرەتادا لایان پەسەند نەبوو، دەنگی دایەوە و ناوبانگی پێ پەیدا کرد. گەلێ لە منداڵانی دنیا، پاڵەوانەکانی ئەسترید: کاڵسۆن، پیپی، میق، ڕۆنیا و...تاد دەناسن و خۆشیان دەوێن.

ئەسترید، بیرەوەرییەکانی خۆی و چۆنیەتیی ژیانی باوک و دایک و منداڵیی خۆی لە سمۆلاند (زێدی نووسەرە) بە کتێبێک نووسیوە.

ئەم نووسەرە ناودارە، چەندین خەڵاتی ئەدەبی وەرگرتووە و گەلێ پرۆژەی یارمەتیی منداڵانی هەیە و لەو نووسەرانەشە، کە داکۆکی لە منداڵانی کورد دەکا.

هەندێ لە بەرهەمەکانی کراون بە کوردی.

کەسێ هەبێ ڕۆژی پانزەی ئۆکتۆبەری

ساڵی پار گوێی لە ڕادیۆ بووبێ؟ کەسێ

گوێی لێ بوو، هەواڵی کوڕێکی ونبوویان دەپرسی؟

ئەئاوایان دەگووت: پۆلیسی ستۆکهۆڵم

بەدوای کوڕێکی نۆساڵانە،

بەدوای (بو ڤیلهێلم ئولسۆن)دا دەگەڕێ،

کەئێوارەی ڕۆژی رابردولەسەعات شەشی ئێوارەوە

لەماڵەکەی خۆی لە ئوپلاندسنگاتان، ژمارە ۱۳،

چۆتە دەرەوە وئیتر نەگەڕاوەتەوە.

بو ڤیلهێلم ئولسۆن قژی کاڵە و چاوی شینە،

لەکاتی ونبوونیدا پانتۆڵێکی کورتی قاوەی لەپێداو

بلووسێکی خۆڵەمێشی چنراوی لەبەردا و

کلێتەیەکی سوری بچکۆلەشی لەسەردا بووە.

هەرکەس هەواڵێکی دەربارەی ونبو لەلایە،
و
دەتوانێ بیگەیێنێتە بەشی هەواڵ وسۆراخی پۆلیس.

بەڵێ، ئاوایان وت، بەڵام هیچ سۆراخێکی بو ڤیلهێلم ئولسۆن نەبوو.

لەماڵ چوو بووە دەرەوە وکەسیش قەت نەیزانی بەرەو کوێ ڕێگای گرتۆتە بەر..

چیرۆکی (میۆ، میۆکەی من) ئاوا دەست پێ دەکات.




لەبڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

نرخی ( ٥ ) دینارە